د.مصطفى محمود

# گفتوگۆیەك لەگەڵ هاوڕێ بێ باوەڕەكەم




وەرگێرانی :

د. فتحی جوهر مزوری

د.مصطفى محمود

# گفتوگۆیەك
# لەگەڵ
# هاوڕێ بێ باوەڕەکەم

وەرگێڕانی :

د.فتحی جوهر مزوری

پێداچوونەوەی زمانەوانی :

م. محەمەدساڵح پێندرۆیی و هونەر مەولود حەسەن

- ناوی پەرتووك : گفتوگۆیەك لەگەڵ هاوڕێ بێ باوەڕەکەم
- نووســینی : د. مصطفی محمود
- تایپ : رەشید کەریم
- وەرگێڕانــی : د. فتحی جوهر مزوری
- پێداچوونەوە: محەمەدساڵح پێندرۆیی و هونەر مەولود حسین
- چاپخانە: رۆژهەڵات
- چاپی : یەکـەم ٢٠١٣
- تیـراژ: (١٠٠٠) دانــە
- نرخ : (٣٠٠٠) دینار
- نەخشەسازی ناوەڕۆك و بەرگ : ئایـوار عبدالله تمرخــان

لــە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیــەکان ژمارەی ســپاردنی ( ٦٧٢ ) ی ساڵی ( ٢٠١٣ ) ی پێدراوە .

" مافی لە چاپدانەوەی پارێزراوە بۆ وەرگێڕ "

# نـــاوەرۆک



## پێشەکی وەرگێــــڕ

پاش سوپاس و ستایشی خودای گەورە ...

ڕاستییەك هەیـە کـە لـە هـیچ کەسـێك شـاراوە نییـە، بـەڵکو لـە سـەرەوەی ڕاسـتییەکانە. ئـەویش ئەوەیـە کـە مـرۆڤ بوونـەوەرێکی لاوازە. دیاردەیەکـە هەقیقەتی مرۆڤ وەکو خۆی دەردەخات. ئەم لاوازیەش لە دونیای بیرو بـاوەڕ زیاتر بەدی دەکرێت، چونکە بە هۆی سروشـتی مـرۆڤ و بیروباوەڕەکەیـەوە کـە هەموو کاتێك ئامادەن بۆ تێکچوون و لاساری و گومـان تێکـەوتن. هـەروەها لـە بەر کاریگەری و گرنگی بیرو بـاوەڕ لـە سـەر ژیـانی مـرۆڤ؛ هـەردەم دەکەوێتـە ژێـر هەڕەشـەی لاوازبـوون و لـە ناوچـوون، بـە هـۆی چـەند هۆکـارێکی دیـارو نادیاری جیاجیاوە.

مرۆڤ هەر چەند خاوەنی بیرو بـاوەڕێکی پتـەو و تـەواو بێـت؛ لـە قۆناغـەکانی ژیانیدا کۆمـەڵێك پرسـیاری بـۆ دروسـت دەبێـت. بەتایبـەت پرسـیارگەڵێك کـە

چارەنووسی بیرو باوەڕەکەی و جێگیربوون و ڕەتکردنەوەی پەیوەستە پێیەوە. جۆرە پرسیارێکن بە خەیالی هەمووماندا دێن و لە هەموو کات و سەردەمێك دووبارە دەبنەوە.... مرۆڤیش بە حوکمی پێویستی، بە دوای وەلامی ڕاستەقینەو دلنیاکەرەوەدا دەگەڕێت.

ئەم نامیلکەیەی کە لە بەردەستی ئێوەی خۆشەویستدایە، لە نووسینی کەسێکی بیرمەند و دیارە، لە دونیای ئەدەب و نووسیندا دەستێکی بالای هەبووە. ئەویش (د. مصطفى محمود)ە. ئەو جۆرە پرسیارانەی دەوروژێنێت کە باسمان کرد و ، هەوڵ دەدات بە شێوەیەکی ژیرانە و زانستیانە و سەردەمیانە وەلامیان بداتەوە.

لە سۆنگەی خستنەڕووی پرسیارەکان و وەلامدانەوەیان بە شێوازێکی تێرو تەسەل و جوان و لۆژیکیانە لە لایەن(د. مصطفى محمود)ە ، هەروەها گرنگی ئەم بابەتە بۆ ئەم ڕۆژگارە و داواکاری چەند هاوڕێیەکی خۆشەویست؛ بە پێویستمان زانی ئەم نامیلکەیە وەرگێڕینە سەر زمانی شیرنی کوردی.... بە هیوای پاداشت و سوود وەرگرتن بۆ خۆم و ئێوەی خۆشەویست.......خودای گەورە پشت و پەنامان بێت....

د. فتحي جوهر مزوري .

هەولێر ١/٣/ ٢٠١٣

# پێشـــــەكی نووسەر

چـونكە خـودا نابینرێـت ... دوارۆژیـش نادیـار و نـەهاتووە ... رۆژی كۆتـایش نەهاتووە و ئەوەی بۆ گۆڕیش دەڕوات ناگەڕێتەوە ....... بازاری بـێ باوەڕەكـان گەشـەی سـەندو بـیرو بـاوەڕی مـاددی باڵادەسـت بـوو. خـەڵكیش كەوتنـە ژێـر كاریگـەری هـەوا و ئارەزووكانیـان و گرنگیـدان بـە دونیـا لـە پێنـاو بەدەسـت هێنـانی سـوود و ئامانجـەكانی دونیـا خۆیـان بـە كوشـتندا... تـا گەیـشتە ئـەو رادەیە كە زۆرێك لە كەسەكان بۆچوونیان وابوو كە هیچ ژیانێكی تـر لـە پـاش ژیـانی دونیـا بـوونی نییـە. هـەروەها دەوڵەتـە زلهێزەكـان كەوتنـە شـەڕ و پێشبڕكێ لە سەر سامانی دونیا .... بـێ بـاوەڕانیش بوونـە خـاوەن جـەماوەر و بیردۆز و فەلسەفە و ڕەتكردنەوەی هەموو جۆرە بۆچوونێكی ئایینی.

هەوادارانی ئەم ڕێڕەوە بوون بە پارێزگار و خزمەتکاری دروشم و گران بەهایەکی تر کە ئەویش زانستە.

بەلاَم کاتێك زاناکان شەریتی بۆماوەیی، یان (DNA) یان دۆزییەوە کە خاوەن (٥) ملیون لاپەڕەیە لەناو خانەیەکی میکروسکوبی پێکهاتووە لە (٣) ملیار پیتی کیمیایی، کە هەموو سیفەتەکانی مرۆڤ لە خۆی دەگرێت، لەو کاتە جیهان بە ئاگا هات و تووشی شلەقان بوو. چۆن ؟ وە کەی؟ هەروەها بە چ پێنووسێکی نەبینراو ئەم کتێبەیان نووسیوە و، هەموو شتێکی لەبارەی ئایندە تێدایە کە هێشتا نەهاتووە؟ کێ ئەم هەموو زانیاریانەی تۆمارکردووە ؟ وە بە چ ئامێرێك ؟ و کێ ئەو توانایەی هەیە ؟

بینیمان چۆن کلێنتۆن سەرۆکی گەورەترین وڵات لە تەلەفزیۆندا ڕاگەیاند و گوتی: لە کۆتاییدا توانیمان زانیاری تەواو لەبارەی شەریتی بۆماوەیی مرۆڤ بەدەست بهێنێن؛ زانایان خەریکبوو بتوانن کۆدی قەدەر و شاراوەکانی مرۆڤ بخوێننەوە، کە ( الله ) نووسیویەتی.

بەم شێوەیە ناوی ( الله )ی هێنا لە وتارەکەیدا.

بەڵێ ئەمە هۆشیارییەکی کاتی بوو. لە دوایدا گفتوگۆیەکی زۆر، هەروەها خەڵك زۆر قسەیان بەناوی ئایین و زانست کرد ناکۆکییان لە نێواندا پەیدابوو، بەم شێوەیە پرسیارە کۆنەکە گەڕانەوە لەبارەی سەربەستی مرۆڤەوە .... ئایا مرۆڤ سەربەستە یان هەوەس کار ؟ ..... ئەگەر خودا هەموو کردەوەکانمانی پێشتر نووسیبێت بۆچی سزامان دەدات ؟ بەڵکو بۆچی مرۆڤ دروست کراوە ؟ ...

ئایا تاوانی ئەو کەسە چییە کە بانگەوازی قورئانی پێنەگەیشتووە؟ ئایا ڕای ئایین چییە لەبارەی پەرسەندن ؟ بۆچی ناکرێت قورئان نووسراو بێت ؟

هەر هەمان گفتوگۆیە کۆنەکە گەڕایەوە نێوان من و هاوڕێ بێ باوەڕەکەم و هەمان بابەت لەبارەی سەریەست و بەربەست ، زیندووبوونەوە ، چارەنووس و هتد. هەموویان بۆنەتە بابەتی هەنووکەیی.

بۆ ئەوەی بەشدار بین بۆ شیکردنەوەی ئەم جۆرە پرسیارانە لە ژێر ڕۆشنایی قورئان و دونیای باوەڕبوون، ئەم پەرتووکەمان خستە بەردەستی ئێوەی خۆشەویست.....

**مصطفى محمود**

# بــــــەشی یەکەم

***- خودا لە کەس نەبووە وە کەسیش لە ئەو نابێت .***

هاوڕێیەکـەم هـەڵگری بڕوانامـەی دکتورایـە لـە وڵاتـی فەرەنـسا ، لـە جیهـانی ئەندێشە و خۆشیدا ژیـاوە تـا گەیـشتە ئـەو ڕادەیـەی کـە هـەموو شـتێك ڕەت بکاتەوە. هاوڕێیەکەم حەزی لە گفتوگۆ و قسەکردنی زۆرە ، هـەروەها بڕواشی وایە ئێمەی بڕوادار مرۆڤی زۆر سادەین و باوەڕ بە شـتی بـێ بنـەما دەکـەین و خۆمان بە هەبوونی بەهەشت و حوری هەڵدەخەڵەتێنین. بە گاڵتەوە بـە منـی گـوت : ئێـوە دەڵـێن خـودا هەیـە و تـەنها بەڵگەشـتان یاسـای هۆکارییـە. ئـەو یاساییەی کە دەڵێت بۆ هەموو دروستکراوێك دروستـکەرێکی هەیـە.... هـەموو خولقێنراوێك خولقێنەرێکی هەیە .... هەموو هەبوونێك هۆکارێکی هەیـە .... چنین بەڵگەیـە لـە سـەر هـەبوونی چنەر.... وێنـە بەڵگەیـە لەسـەر هـەبوونی وێنەکێش.. نەخشە بەڵگەیە بـۆ هـەبوونی نەخـشەکێش ......گـەردوونیش بـە

هەمان ڕێسا و بنچینەوە گەورەترین بەڵگەیە بۆ هەبوونی خودایەکی گەورە و خولقێنەر.

ئێمەش وەڵامی دەدەین و دەڵێین :

پرسیارەکەت بۆگەنە و پێویست و دڵخۆشکەر نییە . تۆ دەڵێی خودا هەیە و پاشان دەڵێی کێ خودای دروست کردووە ؟ واتە لە یەك کاتدا خودا دەکەیتە دروستکەر و دروستکراو. کە ئەمەش دوو شتی دژی یەکترن.

لایەنی دووەمی پرسیارە بۆگەنەکەت ئەوەیە کە خودا ملکەچ دەکەی بۆ یاساکانی دروستکراوی ئەو ..... چونکە یاسای هۆکاری تەنها یاسایە بۆ ئێمەی دروستکراوی ئەو، کە لە کات و شوێنی دیاریکراو دروستکراوین. چونکە ئەو خودایەی کات و شوێنی وەك پێویست دروستکردووە ، خۆی لە سەرەووەی کات و شوێنە. هەروەها بە هیچ شێوەیەك ناکرێت بە کات و شوێن یان یاساکانی کات و شوێن ببەستینەوە . هەروەها خودا دروستکەری یاسای هۆکارە ، لەبەر ئەوە ناکرێت ملکەچ بێت بۆ یاسای هۆکارەکەی، کە خۆی دروستی کردووە.

تۆ بەم فەلسەفە سادەیە وەکو ئەو بووکە شووشەیەی کە لەناو لانەکەی دەجوڵێت و وای بۆی دەچێت کە ئەو مرۆڤەی دروستی کردووە لەگەڵی دەجوڵێت . وە ئەگەر گوتمان بەڵکو ئەو بووکە هەر لە خۆیەوە دەجوڵێت تۆ دەڵێیت ئەستەمە شتێك لە خۆیەوە بجوڵێت، بەهەمان شێوە تۆ بڕوات نییە بەو ڕاستییەی کە دەڵێت خودا بە خۆی هەیە بەبێ ئەوەی هۆکار و دروستکەری هەبێت ...... چونکە تۆ دەبینی هەموو شتێك لە دەوروبەرت پێویستی بە هۆکار و دروستکەرێکە.

تۆ بەم شێوازە بیرکردنەوەیە وەکو ئەو بۆچوونەی، کەوا هەست دەکات خودا پێویستی بە پەرەشوتێکە بۆ ئەوەی لە ئاسمانەوە بێتە خوارێ بۆ لای مرۆڤەکان. یان پێویستی بە پاسێکی خێرایە بۆ ئەوەی بگاتە پێغەمبەرانی خۆی .... خودای پاك و تەنیا زۆر دوورە لەم جۆرە سیفەتانە.

(عەمما نوئێل کانت ) کە فەیلەسوفێکی ئەلمانییە لە کتێبەکەیدا ( نقل العقل الخالص ) ڕای وایە کە ئەقڵ ناتوانێت زانیاری تەواوی هەبێت دەربارەی نهێنی شتەکان ، چونکە ئەم عەقڵە وەها دروستکراوە کە تەنها بە سروشتی خۆی هەندێك شت و شتە دیارەکان بزانێت . لە هەمان کاتدا عەقڵ ناتوانێت بنچینە و بنەمای شتەکان بزانێت ، بۆ نموونە وەکو هەبوونی خودا. ئێمە بە دڵ و دەروون خودا دەناسین نەك بە عەقڵ . مەیل و خۆشەویستمان بۆ دادپەروەری بەڵگەیە لەسەر هەبوونی دادپەروەرێك. هەروەکو چۆن تێنوویەتیمان بەڵگەیە لە سەر هەبوونی ئاو.

بەڵام (ئەرستۆ) کەوا فەیلەسوفێکی یۆنانی کۆنە، درێژە بەیەکەوە بەستنی هۆکارەکان دەدات و دەڵێت :" کورسی لە دار دروست کراوە ، داریش لە درەخت ،.. درەختیش لە تۆوە ... تۆویش لە جوتیارەوەیە .... ئەرستو ناچار بوو درێژە بەم هۆکارە بەیەکەوە بەستراوانە بدات لە کاتێکی بێ کۆتاییدا ".

بەڵام دەبێت بگەینە ئەو دەرئەنجامەی کە دەبێت یەکێك هەبێت بەبێ هۆکار بۆ هەبوونی ئەو . هۆکاری یەکەم بێت و بزوێنەری یەکەمە کە پێویستی بە بزوێنەرێك نییە بۆ ئەو ، خولقێنەرێکە بەبێ ئەوەی پێویستی بە خولقێنەر هەبێت بۆ خۆی...... کە ئەمەش ڕاستییەکە ئێمەی بڕوادار هەمان بڕوامان هەیە.

لـه دوای ئـەوان (ئـیبن عـەرەبی) کـە زانایـەکی موسـڵمانە و کەوتووەتـە ژێـر کاریگـەری فەلـسەفە و سـوفیگەری و بیروبـاوەڕی ( الحلـول والاتحـاد و وحـدة الوجود ) وەڵامی پرسیاری: کێ خودای دروست کردووە؟. دەداتـەوە و دەڵێـت:" ئەمە پرسیارێکە تەنها بە عەقڵێکی نەخۆشـدا دێت، چونکە خـودا خـۆی ئـەم هەبوون و بوونەوەرانە دەسەلمێنێ. ئـەوەك ئـەم بـوون و بوونەوەرانـە بکرێنـە بەڵگە لەسەر خودا، هەروەکو چۆن دەڵێین هەبوونی رووناکی بەڵگەیـە لەسـەر رۆژ، بەڵام ئەگـەر قسەکە سەرا و ژێـر بکـەین و بڵێین : رۆژ بەڵگەیـە لەسـەر هەبوونی رووناکی !!

هەر وەکو گوتراوە و قسەیەکی دیارە لای فەیلەسوفەکان کە گوایە خوای گەورە دەفەرمووێت:((أنا يُستدل بي .... أنا لا يُستدل عليّ )) واتـە : (مـن دەکـرێم بـە بەڵگە ، بەڵام من ناکرێمە بەڵگە لە سەر هەبوونم) . چونکە خـودا بەڵگەیەکـە کە پێویستی بە بەڵگە نییـە . هـەر خـۆی ڕاسـت و روون و ئاشـکرایە .... هـەر ئـەویش بەڵگەیـە لـە سـەر هـەموو شـتێك . خـودا دیـارە لـە هـەموو سیفات و رەوشتە جوانەکانی ئەم گەردوونە، لە یاساکان ... وردەکارییـەکان... جوانی... رێکـوپێکی ... لـە گـەڵای درەخـت ... لـە ڕیـشەکانی تـاووس ... لـە پـەڕەکانی پەپوولـە ... لـە بـوونی گـوڵ ...لـە دەنگـی بولبـول ... لـە جـوانی و رێکـی ئەستێرەکان ... لەو پارچە شیعر و سەمفونیاییەی کـە پێـی دەڵێن گـەردوون .....

ئەگەر ئێمە بڵێین ئەمە هەموو هەر لە خۆیەوە پەیدا بووە بەبێ هۆکار، وەکو ئەوە دەبێت کە پیتەکانی چاپ لە هـەوادا بڵاوبکەینـەوە و لـە دوایـدا هـەر بـە

خۆڕایی پیتەکان بگەنە یەکتر و پارچە شیعرێکی شکسپیر پێك بهێنێت بەبێ شاعیر !!

قورئـانی پـیرۆز زۆر بـە جـوانی و هێمنـی وەڵامـی ئـەم هـەموو پرسـیارانە دەداتــەوە، بـە چـەند وشـەیەکی کـورت وەدەڵێـت:" ﴿ قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ٱللَّهُ ٱلصَّمَدُ لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ وَلَمْ يَكُن لَّهُۥ كُفُوًا أَحَدٌۢ ﴾ الإخـــلاص( ١ – ٤ ). هاوڕێیەکەم بە گاڵتەوە پرسیار دەکات و دەڵێت :" بۆچی ئێوە دەڵێن خـودا یەکـە، بۆچـی خوداکـان زۆر نـابن؟. لـە نێـوان خۆیانـدا کارەکـان دابـەش بکەن"؟!

ئێمە بە هـەمان ڕێـڕەوی ئـەو کـە بـڕوای پـێ هەیـە وەڵامـی دەدەینـەوە ... بـە زانست نەك بە قورئان.... پێی دەڵێین: خودای خولقێنەر یەکە، چونکە ئـەم گەردوونە بە یەك خامە و یەك پلان دانـراوە. لـە هایـدرۆجین و (٩٢) تـوخمی تر پێك هـاتووە، هـەر وەك چۆن لـە خـشتەی ( مەنـدلیف ) دا هـاتووە .... بـە هـەمان ڕێگـا ..... بـە بەیەکگەیـشتن و دەرکردنـی وزەی نـاوەکی کـە هـەموو ئەستێرەکانی ئاسمـان دەدرەوشـێتەوە ، ڕۆژەکـانی گـەردوون هەڵدەگیرسـێن..... هـەروەها ژیـانیش بنیـات نـراوە لـە چـەند ئاوێتەیـەکی کـاربۆن ، هـەموو جۆرەکانی ژیان بەهۆی سووتانەوە دەگوڕێن بۆ خەلووز ، بە یـەك شیکردنەوە ( توێکـار )، شـیکردنەوەی ( توێکـاری ) بـۆق ، کەروێـشك ، کـۆتر ، تیمـساح ، زەرافە ، نەهـەنگ. .... هـەموویان یـەك پلانـی شـێکردنەوەیان هەیـە ، هەمان خوێنبـەر و خوێنهێنــەر ، ژوورەکــانی دڵ ، هــەمان ئێــسك، هـەر ئێـسکێك ئێسکێکی تری وەکو خۆی هەیە ...... باڵەکانی کۆتر وەکو دەستەکانی بۆقە.... هــەمان ئێــسك لەگــەڵ هەنــدێك گۆڕانکــاری کــەم. ملــی زەرافــە ســەرەڕای

درێژییەکەی هەمان شێوەی هەر حەوت فەقەراتی ملی ژووژییە. کۆئەندامی دەمار، هەمان کۆئەندامە لە هەموویان ... پێك دێت لە ئێسك و دەمار و گرێ و دەماری هەست کردن و دەماری جوڵاندن. لە هەموویان هەمان کۆئەندامی هەرسکردن هەیە. پێك دێت لە گەدە و دوانزە گرێ و هی تر .... کۆئەندامی میزکردن پێك دێت لە گورچیلە و حالب و میزڵدان و میزەڕۆ . کۆئەندامی زاوزێش بە هەمان شێوە ... هەموویان یەك پێکهاتەیان هەیە لە گژوگیا و گیانلەبەر و مرۆڤ ، هەمان سیفاتیان هەیە ، زۆردەبن و لە دایك دەبن و دەمرن بە هەمان رێگا..... باشە هیچ شتێکی نامۆ بە دی دەکرێت ئەگەر بڵێین خودا یەکە؟ ، ئایا ئەمانە بەڵگە نین بۆ یەك شێواز ؟!

بۆچی بڵێین زۆر خودا هەن ؟! ئایا هیچ کەم و کورتییەك هەیە بۆ ئەوەی ئەوی تر ئەم کەم و کورتییە پڕ بکاتەوە ؟ ئایا ئەمە دژایەتی نییە؟

ئەگەر زۆر خودا هەبن. ناکۆکی لە نێوانیاندا دروست دەبێت، هەروەکو قورئان بۆمان دیار دەکات. هەریەك شانازی و بەرگری لە کارەکانی دەکات، بەم شێوەیە زەوی و ئاسمان لەناو دەچن. خودای گەورەش لە سیفەتەکانی ئەو، گەورەیی و بە توانایییە، کە ئەمەش دوو سیفەتن ناکرێت هەندێکی تر تێدا بەشدار بن..... هاوڕێیەکەم گاڵتە بە مانای ( ربوبیة ) یش دەکات و دەڵێت:" ئایا جێگای سەرسوڕمان نییە خودا (رب) دەست بخاتە ناو هەموو کارێکی بچووك و گەورەی ژیان. هەر ئەو ڕێنیشاندەری گیانەوەرە ، سروش بۆ هەنگ دەنێرێت و پێی دەڵێت، لە شاخەکان ماڵی خۆت دابنێ، وە هیچ گەڵای دارێك ناکەوێتە خوارێ بەبێ زانین و ڕێپێدانی ئەو ، وە هیچ بەروبوومێك پێناگات و دەرناکەوێت بەبێ هێزی ئەو. وە هیچ گیاندارێك ناتوانێت بەر بگرێت و

بەرەگەی دابنێت بەبێ زانینی ئەو ..... ئەگەر کەسێك بکەوێت ، هەر ئەو وا دەکات کە ئەو بکەوێت. وە هیچ زیندەوەرێك ناکەوێتە ناو خواردەمەنییێك تا ئەو نەکەوێنێت، گەرمی هێلی تەلەفونێك لە کار ناکەوێت تا ئەو حەزی لێ نەبێت ، کاتێك باران نابارێت هەر ئەو رێگرە، وە ئەگەر باریش هەر ئەوە دەبارێنێت. ئایا ئێوە بەم بۆچوونە خودای خۆتان بە ئەرك و ئیشی زۆرەوە ماندوو ناکەن ؟!

لە وەلامەکەیدا دەلێم:" من تێناگەم ئایا خودا بەبۆچوونی پرسیارکەر باشتر وایە خۆی لەم هەموو ئەرکانە لابدات و مۆلەتێك وەربگرێت و پشتی لە گەردوون بکات و بۆ ئەوەی هەمووی لەناو بچێت و یان شتێك ئەوی تر بخوات ؟! ئایا بە بۆچوونی ئەو خودا لە کار کەوتووە، ئاگای لە هیچ شتێك نەبێت نەبینێت و گرنگی بە دروستکراوی خۆی نەدات ؟! لەلایەکی ترەوە، چ هۆکارێك هەیە وای لە پرسیارکەر دەکات کە بلێت ئەم کارە کارێکی بچووك و بێ سوودە ناکرێت خودا خۆی پێوە خەریك بکات. هەروەها ئەم کارە کارێکی گەورەیە پێویستە خۆی بۆ تەرخان بکات ؟!

لە دیدی پرسیارکەر مێشوولەیەکی بچووك و بێ نرخ گرنگ نییە بکەوێتە ناو خواردنێك یان نەکەوێت ، کە ئەویش بە کەوتنە ناوی دەتوانێت رێرەوی مێژوو بگۆرێت بەم کەوتنە بێ نرخە ..... چونکە ئەو دەتوانێت نەخۆشییەکی کوشندە ، وەکو کولێرا بگەیەنێتە هەزارەها کەس و هاوسەنگی مێژوو بگۆرێت ؟! ئایا تۆ نەتزانیوە پێشکە توانی ئەسکەندەری گەورە لە ناو ببات ؟! شتێکی زۆر بچووك دەتوانێت دەرئەنجامێکی زۆر ترسناك بەدوای خۆیدا بهێنێت، شتگەلێکی زۆر بچووك دەتوانێت کارێکی زۆر ترسناك بەدوای

خۆیدا بهێنێت. هەروەها لەوانەشە هیچ زەرەر نەگەیەنێت ! تەنها جیهانی غەیبە نرخی هەموو شتێك دەزانێت ؟ . یاخود هاوڕێکەمان دەیەوێت خۆی بکاتە ڕێنیشاندەر و کارەکانی خودا دیاری بکات ؟ . بەلام خودامان زۆر پاك و دوورە لەم بۆچوونە سادەیە.

خودامان خودایەکە شایەن و شایستەی خودایەتییە ، هەموو شتێك دەزانێت، هیچ شتێکی لێ شاراوە نییە، نە لە ئاسمان نە لە زەوی، ئاگای لە هەموو شتێکە و بەهانایان دێت و چاودێری دروستکراوەکانی خۆی دەکات.

# بـــــــەشی دووەم

## - ئەگەر هەموو کردەوەکانمان لە سەرمان نووسرا بن ، بۆچی خودا سزامان دەدات؟!

هاورێیەکەم ئەم جارە پێی وابوو دەتوانێت بەم پرسیارە رێگەم لێبگرێت و نەتوانم لە دەستی رزگارم ببێ و گوتی:" ئێوە دەڵێن هەموو شتێك بە قەزاو قەدەری خودایە و کردەوەکانمان دیسان بە قەزا و قەدەر لە سەرمان نووسراوە، باشە ئەگەر حاڵم ئاوابێت و کردەوەکانم هەمووی بەم شێوەیە بێت بۆچی خودا سزامان دەدات ؟!

پێم مەڵێ وەکو جاران من سەربەستم، چونکە هیچ درووییەك لەم درووییە گەورەتر نییە، رێم پێبدە پرسیارت لێبکەم: ئایا رۆژی لە دایکبوونت و شێوە و درێژی و پانی و رەنگی لاشەت و نیشتمانت بە دەست خۆت بووە ؟! ئایا بە ویستی تۆ خۆر هەڵدێت و مانگ ئاوا دەبێت ؟!

ئایا بە ویستی من قەزا بەسەرمدا دێت و مردن لەناکاو بەسەرمدا دێت و دەکەومە ناو ناخۆشییەك و هیچ رێگایەك نییە رزگارم بکات تەنها ئەنجامدانی تاوان نەبێت ؟! بۆچی خودا بە ناچاری هەندێك کارم پێدەکات و لە دوایدا لێپێچینەوەشم لەگەڵدا دەکات ؟!

ئەگەر تۆ بڵێی من سەربەستم و بە ویستی خۆم کار دەکەم. ئایا بەم دەرئەنجامە دوو حەز و ویست لە یەك کاتدا پەیدا نابن ؟ حەز و ویستی خۆت لەگەڵ حەز و ویستی خودا، ئایا لەم کاتەدا تۆ هاوەڵ بۆ خودا دروست ناکەی ؟! بە دروستکردنی دوو حەز و ویست؟ پاشان وەڵامت چییە بۆ کاریگەری دەوروبەر و جیاوازی کاتەکان و ئەو زۆرەملێیەی کە زانا ماددییەکان و مێژوو نووسان بڕوایان پێ هەیە؟

هاوڕێیەکەم بەم چەند پرسیارە زۆر دڵخۆش بوو، وای دەزانی من هیچ وەڵامێکم نییە، بەڵکو من لە ڕیزی مردووەکانم تەنها پێویستە بۆ کفن کردن ئامادەبکرێم ؟!

پاشان من زۆر بە هێمنی وەڵامم داوە و گوتم:" تۆ چەند هەڵەیەکت کردووە .... یەکەم جار کردەوەکانت لای خودا زانراون، بەڵام لەسەرت بە زۆری نەنووسراون..... بەڵکو خودا دەزانێت، هەروەکو چۆن بە بۆچوونی خۆت بە کوڕەکەت دەڵێی تۆ زینا دەکەی، پاشان وا روویدا و کوڕەکەت زینای کرد، ئایا تۆ کوڕەکەت وا لێکرد کە ئەو کارە بکات ؟ یانیش ئەوە تۆ دەتزانی و هەروەکو چۆن لە قەدەردا نووسراوە ؟.

قسەکانت دەربارەی سەربەستی، درووییەکی ترە، کاتێك بەڵگە دەهێنیت و دەڵێی من سەربەست نیم لە دیارکردنی رۆژی لە دایك بوونم ، لە چۆنیەتی

دیارکردنی شێوەم، درێژی خۆم، ڕەنگ و سیمای خۆم، نیشتمانی خۆم، وە هەروەها تۆ ناتوانی شوێنی خۆر بگۆڕی ئەمە تێکەڵییەکی ترە، هۆکاری ئەم تێکەڵییەش تۆ بڕوات وەکو بڕوای ئێمەی بڕوادار نییە، تۆ باسی سەربەستیەکی ڕەها دەکەی......

تۆ دەڵێی:" ئایا بۆچی من ناتوانم خۆم دروست بکەم و ڕەنگ و درێژی و کورتی خۆم دیاری بکەم، ئایا من بۆچی ناتوانم خۆر لە شوێنەکەی لابدەم یان رابگرم..... کوا سەربەستییەکەم؟!

ئێمە پێت دەڵێین: تۆ باسی سەربەستییەکی ڕەها دەکەی. سەربەستییەك کە هیچ سنووری بۆ نەبێت، سەربەستی دەستکاریکردنی ئەم گەردوونەیە، کە بە ویستی خۆت ڕێڕەو و ڕێکخستنەکەی بگۆڕی.... کە ئەمەش تەنها کاری خودای تاك و تەنیایە. خودا دەفەرموویێت: ﴿ وَرَبُّكَ يَخْلُقُ مَا يَشَاءُ وَيَخْتَارُ مَا كَانَ لَهُمُ الْخِيَرَةُ سُبْحَانَ اللَّهِ وَتَعَالَىٰ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴾ القصص:(٦٨) واتە: ( هەر پەروەردگاری تۆیە هەر چیەکی بوێت دروستی دەکات و هەڵی دەبژێرێت، خەڵکی ئەو دەسەڵاتەیان نییە و سەر پشك نەکراون، پاکی و بێگەردی و بڵندی بۆ خوایە لە بەرامبەر ئەو شتانەوە نەفامان دەیکەنە شەریك و هاوەڵ)[1]. هەروەها خودای گەورە لێپێچینەوەت لەگەڵدا ناکات لەبارەی کورتی و درێژیتەوە ، سزاشت نادات، چونکە تۆ توانای ئەوەت نەبووە ڕێڕەوی خۆر بگۆڕی، بەڵکو خودای گەورە لە سەر ئەو داواکاریانە سزات دەدات

١- ڕافەی گشت ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز لە پەرتووکی تەفسیری ئاسان، لە نووسینی مامۆستایی پایەبەرز بورهان محمد امین وەرگیراوە.

كە وەكو ئـەركێك بـە تـۆی سپاردوون، بـەڵام ئـەنجامت نـەداون، تـۆ لـەم بـوارە سەربەسـت بـووی لـە كـردن و نـەكردنی. لـە تواناتـدا هـەبوو زاڵبـی بەسـەر ئارەزووەكانتدا، توورەبوونەكەت كپكەیەوە ڕێگری لە كارە خراپەكانت بكەی و هەوڵبدەیت بۆ ئەنجامدانی كاری چاكە.......

تۆ دەتوانیت خۆت و ماڵت لـە پێنـاو خـودا دا ببەخشی.... تـۆ دەتوانیـت درۆ بكەی یان ڕاست بڵێیت..

تۆ دەتوانیت خۆت لە ماڵی حەرام بپارێزی ، تـۆ دەتوانیـت چاوەكانت داپۆشـی لە سەیركردنی نامووسی خەڵكی........

تـۆ دەتوانیـت زمانـت بپـارێزی لـە قسەی خـراپ و ناشـیرین..... لـەم بارەیـەوە خودا لێپێچینەوەت لەگەڵدا دەكات  و سزات دەدات......

ئـەو سەربەسـتییەی كـە مەبەسـتمانە و ئێـستا باسـی لێـوە دەكـەین. تـەنها سەربەستییەكی سنووردارە، نەك سەربەستییەكی ڕەها، سەربەستی مـرۆڤ لـە ڕووی ئـەو داواكاریانـەی كـە لـە مرۆڤـەكان كـراون. ئەمـە سەربەسـتی ڕاسـتەقینەیە، بەڵگـەش لەسـەر ڕاسـتەقینەبوونی ئـەم سەربەسـتییە، هەسـتكردنمانە لـە ناخـەوە بـە بەرپرسـیارێتی، پەشـێمانبوونەوەمانە لـە ئەنجامدانی كاری نابەجێ، ئارامگرتن لەسەر ئەنجامدانی كاری چاكە. ئێمـە لـە هەموو كاتەكانی ژیانماندا شت هەڵدەبـژێرین، بـەراورد لـە نێـوان گریمانـەكان دەكەین. بەڵكو ئەركی هەرە بنەڕەتی عەقڵ ئەوەیـە شـتەكان لێكجیـا بكاتـەوە، یەكێك لە نێوانیان هەڵبژێریت هەروەها ئێمە زۆر بە ئاسانی جیاوازی دەكەین لە نێوان لەرزینی لاشەمان بەهۆی گرانەتاوە، هـەروەها هـەژانی دەروونمـان لـە كـاتی نووسـینی شـتێك. لـەرزینی یەكـەم لەرزینێكـە بەدەسـت خۆمـان نییـە،

دووەمیان بە دەستی خۆمانە...... ئەگەر لە هەردوو جوڵە و لەرزین سەربەست نەبووباین، ئەوا نەمان دەتوانی جیاوازی لە نێوانیاندا بکەین..... بۆ دڵنیابوون لە هەبوونی ئەم جۆرە سەربەستییە باشترین بەڵگە ئەمەیە کاتێك کە دڵمان حەزی لە شتێك نەبێت مەحاڵە ئاراستەکەی بگۆڕێت، هەرچەندە ئەگەر هێزی پاڵەپەستوشی بخرێتە سەر، هەروەها تۆ دەتوانی بە ترساندن و بە زۆر جل و بەرگ بەر ئافرەتێك بکەیت، بەڵام ناتوانی وای لێ بکەی لە دڵەوە تۆی خۆش بوێت، ئەمەش مانای وایە کە خودای گەورە دڵەکانمانی بە سەربەستی دروستکردووە و ڕزگاری کردووە لە هەموو جۆرە زۆرلێکردنێك. هەر لەبەر ئەمەشە، خودای گەورە دڵ و نیاز (نیة)مانی کردووە بە بنچینەی هەموو حوکمێك. واتە مرۆڤ هیچ سزایەك یان پاداشتێك وەرناگرێت لەسەر کردەوەکانی ئەگەر نیاز و دڵی لەگەڵ نەبێت. ئەگەر مرۆڤی بڕوادار بەهۆی تۆقاندن و زۆرلێکردنەوە وشەی کوفر بێت بە سەر زمانیدا، خودای گەورە لێپێچینەوەی لەگەڵدا ناکات. لەبەر هەمان هۆ خودای گەورە دەفەرموێت:﴿ ......إِلَّا مَنْ أُكْرِهَ وَقَلْبُهُۥ مُطْمَئِنٌّۢ بِٱلْإِيمَٰنِ .... ﴾ النحل(١٠٦)،واتە: (... جگە لەوانەی کە ناچار دەکرێن وشەی کوفر بێت بەسەر زاریاندا لە کاتێکدا دڵیان پڕە لە ئیمان....).

ڕوویەکی تری ئەم تێکەڵییە لەم بارەیەوە ئەوەیە، کە هەندێ خەڵك سەربەستی مرۆڤەکان بەجۆرێك تێدەگەن و دەڵێن ئەم سەربەستییە جۆرە زاڵبوونێکە لەسەر حەز و ویستی خودادا، جۆرە تاکڕەوییەکە لە ئەنجامدانی کارەکان. بەم شێوەیە هاوەڵ بۆ خودا دروست دەکەین. وەکو ئەو بڕیار دەدەین و شت بەڕێوە دەبەین.

هاوڕێیکەم بەم شێوەیە لەم سەربەستییە تێگەیشتووە. لەسەر ئەم بنچینەیە بڕوای وایە دوو حەز و ئارەزوو دروست دەبن، بەڵام ئەمە تێگەیشتنێکی ڕاست نییە، چونکە سەربەستی مرۆڤەکان زاڵ نابێت بەسەر بڕیار و حەزی خودای گەورەدا.......

مرۆڤەکان دەتوانن بە هۆی سەربەستی خۆیانەوە شتێك ئەنجامبدەن پێچەوانەی ڕازیبوونی خودا بێت، بەڵام ناتوانن شتێك ئەنجامبدەن پێچەوانەی ویست وحەز و ئارەزووی (إرادة ومشيئة) خودا بێت......

کەواتە خودا سەربەستی بە ئێمە داوە، کە بەپێی ئەم سەربەستییە تاوان بکەین و بەبێ ئەوەی پێی خۆش بێت. بەڵام ناتوانین بەپێچەوانەی حەزی ئەو بجوڵێینەوە. کە ئەمەش جۆرێکە یان بەشێکە لەو سەربەستییە سنوردارەی کە باسمان کرد. بۆیە هەرشتێك ئێمە ئەنجامی بدەین لە چوارچێوەی حەز و ئارەزووی ئەو دەرناچێت، هەرچەندە دەکرێت ڕەزامەندی خودای لەگەڵدا نەبێت و پێچەوانەی شەریعەتیش بێت. سەربەستی مرۆڤەکان بەخششێکی خودایە بە ئێمەی مرۆڤ بەخشیوە، نەوەك ئێمە ئەم سەربەستییەمان بە زۆر بەدەست هێنابێت.

سەربەستیمان بەشێکە لە حەز و ئارەزووی خودا، چونکە خودا دەفەرمووێت:

﴿وَمَا تَشَآءُونَ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيمًا حَكِيمًا﴾ الإنسان (٣٠).

واتە: (دڵنیاش بن: ئێوە هیچتان پێناکرێت و هیچ کارێکتان پێ ئەنجام نادرێت مەگەر خوا ویستی لەسەر بێت، بێگومان ئەو خوایە زانا و دانایە دەزانێت کێ شایستەی هیدایەتە، داناشە لە هیدایەتدانی بەندە چاکەکاندا)، چونکە حەزی مرۆڤەکان بەشێکە لە حەزی خودا، بەخشین و چاکە و فەرمانی ئەوە. کەواتە

حەزمان بە ویستی ئەوە، هیچ دژایەتییەك لە نێوان ئەم دوو حەزەدا نییە، مرۆڤ بە حەزی خۆی پێشبڕكێ لەگەڵ حەزی خودا ناكات....... سەربەستی بەم مانایە پێچەوانەی یەكتاپەرستی نییە. ناچێتە چوارچێوەی هاوەڵ دروستكردن بۆ خودا و وەكو ئەو بڕیار بدەن. كەواتە سەربەستیمان هەمان بڕیار و حەز و ویستی خودایە.

ڕووی سێیەمی ئەم تێكەڵییە ئەوەیە كە هەندێك خەڵك پێیان وایە هەبوونی قەزا و قەدەر و سەربەستیَ و بەربەستی مرۆڤەكان، جۆرێكە لە زۆرەملیێ، وا دەكات مرۆڤەكان بە پێچەوانەی سروشت و ویستی خۆیان بجوڵێنەوە، كە ئەمەش بڕوایەكی چەوتە، هاوڕێكەشم تێی كەوتووە. چونكە خودا لە زۆر ئایەتی پیرۆزدا زۆركردن لە مرۆڤەكان ڕەت دەكاتەوە. بۆ نموونە لە ئایەتێكدا دەفەرمووێت:﴿ إِن نَّشَأْ نُنَزِّلْ عَلَيْهِم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ ءَايَةً فَظَلَّتْ أَعْنَٰقُهُمْ لَهَا خَٰضِعِينَ ﴾ الشعراء(٤)، واتە: ( خۆ ئەگەر بمانەوێت موعجیزەیەكیان لە ئاسمانەوە بۆ دادەبەزێنین ئەوسا بەردەوام گەردنیان بۆی ملكەچ و زەلیل دەبێت)، هەروەها دەفەرمووێت:﴿ لَآ إِكْرَاهَ فِى ٱلدِّينِ قَد تَّبَيَّنَ ٱلرُّشْدُ مِنَ ٱلْغَىِّ .... ﴾ البقرە(٢٥٦)،واتە: (بە هیچ جۆرێك زۆر كردن نیە لە وەرگرتنی بیروباوەڕی ئاینی ئیسلامیدا، چونكە بە ڕاستی ڕێبازی چاك و دروست؛ ڕوون و ئاشكرا بووە و جیابۆتەوە لە گومڕایی و سەركەشی...). هەروەها لە سورەتی یونسدا دەفەرمووێت:﴿ وَلَوْ شَآءَ رَبُّكَ لَءَامَنَ مَن فِى ٱلْأَرْضِ كُلُّهُمْ جَمِيعًا ۚ أَفَأَنتَ تُكْرِهُ ٱلنَّاسَ حَتَّىٰ يَكُونُوا۟ مُؤْمِنِينَ ﴾ یونس(٩٩)، واتە: (خۆ ئەگەر پەروەردگارت بیویستایە ( دەیتوانی بە زۆر و بە ناچاری) هەر هەموو دانیشتوانی سەر

زەوی باوەڕ بهێنن ( بەڵام پەروەردگاری مەزن ڕێزی بۆ ئادەمیزاد داناوە و سەرپشکی کردووە)، جا ئایا تۆ ( ئەی پێغەمبەر ( صلی الله علیه و سلم)، ئەی ئیماندار) ئەتەوێ زۆر لە خەڵكی بکەی بۆ ئەوەی بڕواداربن؟!).

کەواتە قەزا و قەدەر ناکرێت ئەوها تێکەڵبن، وەکو جۆرە زۆرەملێیەك و دژی ویست و سروشتی مرۆڤەکان، بەڵکو بە پێچەوانەوە......

خودای گەورە بەگوێرەی نیازی مرۆڤەکان کارەکان ئەنجامدەدات. ئەو شتەی بۆ پێخۆشە کە لە ڕەگەزی حەزەکەیەتی ، ئەو شتەی بۆ دەوێت کە لە ڕەگەزی ویستیەتی، هیچ دژایەتییەك لە نێوان حەزی خودا و سەربەستی و حەزی مرۆڤەکاندا نییە......

ویستی خودا بۆ مرۆڤەکان هەمان سەربەستی مرۆڤەکانە، چونکە خودا هەموو شتێك بەڕێدەکات و بەڕێوەدەبات بەپێی حەزی دڵ و نیازەکانی مرۆڤ. خودا دەفەرموویت: ﴿ مَن كَانَ يُرِيدُ حَرْثَ ٱلْآخِرَةِ نَزِدْ لَهُۥ فِى حَرْثِهِۦ ۖ وَمَن كَانَ يُرِيدُ حَرْثَ ٱلدُّنْيَا نُؤْتِهِۦ مِنْهَا وَمَا لَهُۥ فِى ٱلْآخِرَةِ مِن نَّصِيبٍ ﴾ الشوری(٢٠).

واتە: (جا ئەوەی کە بەرهەمی قیامەتی دەوێت و لە دنیادا کار و کردەوەی چاك دەچێنێت، ئێمە پاداشتی هەوڵ و کۆششەکەی بە زیادەوە پێدەبەخشین، ئەوەش کە بەرهەمی دنیای دەوێت؛ هەندێك لە دنیای پێ دەبەخشین، ( بەڵام) لە قیامەتدا هیچ جۆرە بەشێکی نیە).

هەروەها دەفەرموویت:﴿ فِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ فَزَادَهُمُ ٱللَّهُ مَرَضًا ۖ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌۢ بِمَا كَانُوا۟ يَكْذِبُونَ ﴾ البقرە(١٠). واتە: ( ئەوانە لە دڵ و دەروونیاندا نەخۆشی بێ باوەڕی و حەسوودی و کینە هەیە، خوایش ( بەسەرخستنی حەق و

ئیمانـداران) ئەوەنـدەی تـر دەردیـان گـران و کاریگـەر دەکـات و سـزایەکی سـەختیش ( لـە دنیـا و قیامەتـدا) چـاوەڕێیانە بـە هـۆی درۆکـردن). وە لـە سـورەتی (محمـد)دا دەفـەرمووێت:﴿ وَٱلَّذِينَ ٱهۡتَدَوۡاْ زَادَهُمۡ هُدٗى وَءَاتَىٰهُمۡ تَقۡوَىٰهُمۡ ﴾ محمد(١٧). واتە: (ئەوانەش ڕێبازی هیدایـەت و ئیمانـدارییان گرتۆتـە بـەر بـە گوفتـاری پێغەمبـەر ( صـلی الله علیـه وسـلم) هیدایـەت و دینـدارییان گەشـە دەکات و پەرە دەسێنێت، خوایش شارەزایی و پارێزکاریی و دڵنیـایی زیـاتری پێدەبەخشین).

خـودای گـەورە لـە سـورەتی (الأنفـال) باسـی دیلـەکانی شـەڕی بـەدر دەکـات و دەڵێـت:﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ قُل لِّمَن فِيٓ أَيۡدِيكُم مِّنَ ٱلۡأَسۡرَىٰٓ إِن يَعۡلَمِ ٱللَّهُ فِي قُلُوبِكُمۡ خَيۡرٗا يُؤۡتِكُمۡ خَيۡرٗا مِّمَّآ أُخِذَ مِنكُمۡ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡۚ وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴾ الانفـال(٧٠). واتـە: ( ئەی پێغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم): بەو دیلانە بڵێ کە لەبەر دەستاندان، ئەگـەر خـوا خێـر لـە دڵەکانتانـدا بـەدی بکـات، ئـەوە زۆر لـەوە باشـترتان پـێ دەبەخشێت کە لێتان وەرگیراوە، ( ئەگـەر بـاوەڕ بهێـنن) لێتـان خـۆش دەبێـت، خوایش لێخۆشبوو میهرەبانە).

هەموو شتێك بە قەزا و قـەدەرە، قـەزا و قەدەرەکە بـەگوێرەی نیـاز و حـەزی دڵتانە ...... ئەگەر خراپـە، ئـەوا خراپـە دەبێـت ... ئەگـەر چـاکە، ئـەوا چـاکە دەبێـت.....واتـە هـیچ دژایـەتی و دووانییـەك لێـرە نییـە و هـەموو ویـستێك لەلایەن خودا هەمان سەربەستی مرۆڤەکانە....

خودای گەورە بەڕێوەمان دەبات بەپێی هەڵبژاردنی دڵ و نیازمـان، بـەبێ هـیچ زوڵـم و زۆرەملێیـەك، کـە پێـچەوانەی سروشـتمان بێـت، خـودای گـەورە لـە

سـورەتی اللیـل دەفـەرموێت:﴿ فَأَمَّا مَنْ أَعْطَىٰ وَاتَّقَىٰ وَصَدَّقَ بِالْحُسْنَىٰ فَسَنُيَسِّرُهُ لِلْيُسْرَىٰ ﴾ اللیل(٥-٧).

واتە: (جا ئەوەی ( ماڵ و سامان و زانستی و... هتد) دەبەخشێت و پاریزکار و لە خواترسە؛ بڕوای پتەوی بە پاداشتی چاك و بە نرخی خوایی هەیـە، ئـەوە ڕێگەی چاکە و چاکەکاری بۆ ئاسان دەکـەین و سـەر ئـەنجام دەیخەینـە خێـر و خۆشیەوە).

هـەروەها لـە سـورەتی (الأنفـال) لـەبارەی شـەڕی بـەدرەوە دەفـەموێت:﴿ فَلَمْ تَقْتُلُوهُمْ وَلَٰكِنَّ اللَّهَ قَتَلَهُمْ ۚ وَمَا رَمَيْتَ إِذْ رَمَيْتَ وَلَٰكِنَّ اللَّهَ رَمَىٰ ...... ﴾

الانفـال(١٧). واتــە: ( کــەوابوو ئــەی ئیمانــداران: وەنــەبێت ئێـوە کافرانتــان کوشتبێت، بەڵکو خوا کوشتنی و لەناوی بـردوون، تـۆش ئـەی محەمـەد ( صـلی الله علیە و سلم) کاتێك مشتێك خۆڵت ڕوو بە کافران فڕێدا ئەو کارە تەنها تـۆ نەتکرد، بەڵکو خوا فڕێیدا). کەواتە هاوێشتنی بەندە و هاوێـشتنی خـودا یـەك هاوێشتنـە، ئەمە باشترین بەڵگەیە لە سەر قەدەری خودا، بەندە نییەت دەکات، خوداش بە یارمەتیدانی جێبەجیٚ دەکات ........

هەر لەسەر ئەم بنەمایە، بۆمان دەردەکەوێت کە سەربەسـتی مـرۆڤ ڕێژەیـەکی جێگری نییە، بەڵکو سنوردارە و دەرفەتی زیادبوونی هەیە..

مرۆڤەکان دەتوانن ڕێژەی سەربەستی خۆیان زیاد بکـەن بـە زانـست وەرگـرتن، بە داهێنانی ئامراز و ئامێری نوێ، مرۆڤ توانییەتی دوورییەکانی گوێی زەوی لێکنزیك بکاتەوە و بەسەر کات و شوێندا زاڵ بێت. هەروەها مرۆڤ بە زانینـی یاساکانی دەوروبـەری خـۆی توانیویـەتی زینـدەوەرەکان بـۆ بەرژەوەنـدی خـۆی

بەکاربهێنێت هەروەها مرۆڤ توانیویەتی بەسەر گەرما و سەرما و تاریکیدا زاڵ ببێت.... بەم شێوەیە مەودای سەربەستی مرۆڤ زیادی کردووە... کەواتە زانست ئامرازێك بووە بۆ ئەوەی مرۆڤ لە بەربەستەکان ڕزگار بکات و سەربەستی زیاتر بەدەست بهێنێت .

ئامرازی دووەم ئاینە، بەهۆی بڕوابوون بە خودا و زیاتر لێی نزیکبوونەوە و زانیاری وەرگرتن لە سروش و پشتگیری کردنی، کە ئەمەش ڕێگای پێغەمبەران و ئەوانەی لەسەر ڕێگای ئەوانن.......

سلێمان پێغەمبەر بە پشتیوانی و پشتگیری خودا توانی لەگەل جنۆکە قسە بکات و هەروەها باڵندە و مێروولە، تەنانەت خودا هەوای بۆ ملکەچ کردبوو.... موسا پێغەمبەر دەریای کرد بە دوو لەت..... عیسا توانی مردووەکان زیندوو بکاتەوە و لە سەر ئاو بڕوات و نابینا و کەڕ و لال چاکبکاتەوە.......

هەروەها پیاوچاکان و خواناسان زۆر شت لەسەر دەستیان ڕوویداوە.... کە ئەمەش چەند پلە و پایەیەکن بە پاڕانەوە و خوداپەرستی بەدەستیان هێناوە و توانییان مەودای سەربەستی خۆیان بە نزیکبوونەوە لە خودای گەورە زیاد بکەن، لە بەرامبەردا خودای گەورە زۆر شتی نهێنی و شاراوەیان پێ نیشانداون.

دیسان هەر زانستە مەوداکان زیاد دەکات، بەڵام ئەم جارە زانستی خوداوەندی (لدني)یە ، ئەبو حامدی غەزالی باسی ئاریشەی سەربەست( هەوەسکار) و بەربەست( بەڕێوەبراو) دەکات و دەڵێت: مرۆڤەکان سەربەستن لەو شتانەی دەیزانن، بەڵام بەربەستن لەو شتانەی نایزانن. مەبەستی ئەویش لەو قسانە

ئەوەیە کە دەیەوێت بڵێت هەرچەند زانستی مرۆڤ زیاد بکات ئەوەندە مەودای سەربەستیەکەی زیاد دەبێت، ئەوجا ئەو زانستە زانستێکی بابەتیانە بێت یان زانستێکی خوداوەندی (لدني).

زانا ماددیەکان زۆر بە هەڵەدا دەچن، کاتێك دەڵێن مرۆڤ بە دیلگیراوی رووداوە هەبووەکانی مێژوو و سیستەمی چینایەتییە. مرۆڤ دەکەنە بازنەیەك لە زنجیرەکانی ژیان کە کۆتایی پێ نایەت و هەردەبێت ملکەچ بێت بۆ یاساکانی ئابووری و گۆڕانکاریەکانی کۆمەڵگا. بەم شێوەیە مرۆڤ وەکو پارچە دارێکە بەسەر تەوژمی ئاودا هیچ هانا و حەز و ویستی بە دەستەوە نییە.

قسەیەك هەر دووبارە دەکەنەوە و لەگەلیش ماندوو نابن، وەکو یاسایەك تەماشا دەکەن، کە ئەویش گوتنی: هەبوونی(الوجود) ناکۆکی چینایەتییە، کە ئەمەش وشەیەکی نادروستە لە رووی زانستییەوە، چونکە هیچ وشەیەك نییە بەناوی هەرەبوون لە رووی مرۆڤایەتییەوە بەڵکو کۆمەڵێك گریمان و پێشخەرییەکن...... هەر ئەمەش بووەتە هۆی جیاوازی لە نێوان مرۆڤەکان و ئامڕازەکان و تەنە ماددیەکان، مرۆڤ دەتوانێت گریمانی گیرانی خۆر بکات بە خولەك و چرکە، هەروەها چۆنیەتی خولانەوەی خۆر بەدرێژایی رۆژ و ساڵەکان....... بەڵام لەبارەی خودی مرۆڤەوە ئێمە ناتوانین بزانین چی لەناو دڵیدا هەیە و بەنیازی چییە، یان سبەینێ چ کارێك دەکات. تەنها دەتوانین گریمانی بۆ دابنێین و وا گومان ببەین، ئەگەر هەندێك زانیاری پێشوەختە دەستمان بکەوێت.

لەبەرئەوە هەموو گریمانەکانی (کارل مارکس) بە ناڕاست دەرچوون، کە دەیگوت: شیوعیەت لە وڵاتێکی پێشکەوتوو جێبەجێ دەکرێت، بەڵکو لە چەند

وڵاتێکی دواکەوتوو پەیڕەوکراو بۆ ماوەیەکی کەم لەناوچوو. هەروەها گوتی: نـاکۆکی و پێـشبڕکێ لـە نێـوان شـوعییەت و سـەرمایەداری پەرەدەسـێنێت، ئەمەش ڕووی نەدا، بەڵکو بە درێـژایی ساڵەکان ئـەم دوو ئایدیایـە زیـاتر لـە یەکتر نزیك بوون، دەوڵەتە شیوعیەکان دەرگایان بـۆ سـەرمایەداری ئـەمریکی واڵا کـرد، هـەروەها دەیگـوت: لـە کۆمـەڵگا سـەرمایەدارەکان دژایەتیـەکان زۆر دەبن و لـە کۆتاییدا بـەرەو نـەداری و مایەپووچبوون دەچن. ئەمـەش ڕووی نەدا، بەڵکو بە پێچەوانەوە، ئابووریان گەشـەی سـەند و نـاکۆکی کەوتـە نێـوان ئەو وڵاتانە کە خاوەن ئایدیای شیوعیەت بوون.

هەموو ئامار و بۆچوونەکانی مـارکس بەڕاسـت دەرنەچوون. چونکە شێواز و ڕێڕەوەکەی ڕاست نـەبوو، کـە ئـەویش هەبوونـە. بینیمـان نـاکۆکی و پێـشبڕکێ تەنها لەو وڵاتانەیە کە پەیڕەوی ناچینایەتی دەکەن، وەکو چین و ڕوسیا، نەك نـاکۆکی و پێـشبڕکێی چینایەتی هـەروەکو مـارکس بـۆی دەچـوو...... ئەوانـە هەموویان بەڵگە و نموونەن لەسەر سەرنەکەوتنی هزر و بیری ماددی لە دیدی تێگەیشتنی مرۆڤەوە بۆ ڕووداوەکانی مێـژوو، سـەرنەکەوتنی و سەرلێـشێوانی لـەبارەی بۆچـوونەکانی دوارۆژ...... ئـەم چـەوتیانە دەرەنجامی ڕاسـتەقینەن، لەسەر سەرنەکەوتنی هزر و بیری ماددی بەسەر مرۆڤدا. ئەو هزرەی کە مرۆڤ دەکاتـە پێـشکەییەك لەسـەر تـۆڕی هـەبووەکان(الموجـودات)، ملکەچـی چـەند یاسایەکە، کە لە سەر مرۆڤ دانـراوە....... بـە تـەواوی لـە بیری کـرد کـە مـرۆڤ سەربەستە و سەربەستیەکەیشی شتێکی ڕاستەقینەیە.

بۆ ئەوانەش کە دەڵێن مرۆڤ ناچارە ملکەچ بێت بۆ یاساکانی ژینگە و کۆمـەڵگا و بارودۆخەکان، مرۆڤ ناتوانێت بە تەنیا بژیت، سەربەستیەکەیشی لە بۆشایدا

نییە. دەڵێین: هەبوونی کاریگەری ژینگە و کۆمەڵگا و بارودۆخەکان لەسەر سەربەستی مرۆڤ ڕاستکردنەوە و دڵنیابوونە لەسەر سەربەستی تاکەکەسی، چونکە ئەم سەربەستییە ئەگەر بەرەنگاربوونەوەی نەبێت و بیجوڵێنێت تەواو نابێت. کەواتە ئەگەر مرۆڤ لە بۆشاییێکدا بسووڕێتەوە بەبێ بەربەست و بەرەنگاربوونەوە، لەوکاتەدا هیچ تەنگانەیەك نابێت مرۆڤ هەوڵبدات بەسەریدا زاڵ بێت، بۆ ئەوەی چەمکی سەربەستی واتایەکی تەواو بەرجەستە بکات.

# بەشی سێیەم

## - بۆچی خودای گەورە شەڕی دروستکرد ؟

هاوڕێیەکەم بە گاڵتەوە گوتی:

ئێوە چۆن دەڵێن خودامان خودایەکی تەواوە و، میهرەبان و بە بەزەییە، هەروەها بەخشندە و لێبوردەیە. لە هەمان کاتدا هەرچی تاوان و کاری خراپە هەیە لەو جیهانە ئەو دروستی کردووە...... نەخۆشی، پیربوون، مردن، زەوی لەرزین، گڕکانەکان، میکروبی کوشندە، ژەهر، گەرما، سەرما، ئازار ، شیرپەنجە....... کە هیچ کەسێك تێپەڕ ناکات نە منداڵ نە پیاوی بە ساڵاچوو......

ئەگەر جوانی و خۆشەویستی و چاکی، لە سیفەتەکانی خودای ئێوە بن، بۆچی توندوتیژی و تۆڕەیی و ناشیرینی و کارە خراپەکان دروست دەکات؟.

ئەو ئاریشەیەی هاوڕێیەکەم دەوروژێنێ، لە ئاریشە بنەڕەتیەکانی فەلسەفەیە، زۆر قوتابخانەی فەلسەفی لەسەری ناکۆك بوون، بیروباوەڕی جۆراوجۆر لە مەڕ ئەم بابەتە سەریان هەڵدا، بەلام ئێمە دەڵێین خودای گەورە هەمووی بەزەییە و هەمووی چاکەیە، هیچ کاتێك داوا لە بەندەکان ناکات کاری خراپ ئەنجامبدەن، بەڵکو ڕێی پێدەدات بۆ مەبەستێك کە ئێمە نانزانین. خودای گەورە لە سورەتی الأعراف دەفەرمووێت:﴿ ....قُلْ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَأْمُرُ بِٱلْفَحْشَآءِ أَتَقُولُونَ عَلَى ٱللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ قُلْ أَمَرَ رَبِّى بِٱلْقِسْطِ وَأَقِيمُوا۟ وُجُوهَكُمْ عِندَ كُلِّ مَسْجِدٍ وَٱدْعُوهُ مُخْلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ كَمَا بَدَأَكُمْ تَعُودُونَ ﴾ الاعـــراف:(٢٨-٢٩).

واتە: ( ئەی محەمەد ( صلی الله علیه و سلم) پێیان بڵێ: ( نەخێر وانییە) چونکە بە ڕاستی خوا فەرمان بە گوناه و تاوان و کاری نابەجێ نادات، چۆن ( جەسارەت دەکەن) و شتێك هەڵدەبەستن بۆ خوا کە نازانن وتویەتی یان نا؛ هەروەها بڵێ: پەروەردگارم فەرمانی بە دادپەروەری داوە، لە کاتی هەر پەرستن و نوێژێکدا، لە هەموو مزگەوتێکدا، رووی دڵ و روخسارتان بەڕاستی لە پەروەردگارتان بکەن و بیپەرستن و لێی بپاڕێنەوە، لە کاتێکدا دینداری بێگەرد و دڵسۆزانە هەر بۆ ئەو زاتەیە، چونکە هەر چۆن دروستی کردوون لە سەرەتاوە، لە ئایندەشدا هەر بۆ لای ئەو دەگەڕێنەوە).

کەواتە خودا تەنها داوای دادوەری و خۆشەویستی و چاکە و لێبوردن دەکات، هەروەها تەنها بە کردەوەی چاك ڕازی دەبێت.

باشە ئەگەر وایە بۆچی خودا ڕێی بە ستەمکار داوە ستەم بکات و بکوژ کوشتن بکات و دزیکەر دزی بکات ؟!

لــه وەڵامــدا دەڵــێین: چــونکە خــودا دەیــەوێت ئێمــە سەربەســت بــین....
سەربەستیش هەڵەی تێدایە، چونکە سەربەستی هیچ مانایەکی نییـە ئەگـەر ئێمە کاری چاك و خـراپ ئـەنجام نـەدەین..... هەڵبـژاردن بـە دەسـتی خۆمـان نەبێت لە نێوان تاوان و پەرستشدا.
لــە توانــای خــودا دایــە هــەموومان سەربەســت بــین، ئــەویش بــەوەی کــە بەردەوامەمان بکات لەسەر گوێڕایەڵی و عیبادەت، بەڵام ئەمەش دەبووە هۆی لە دەستدانی مافی هەڵبژاردن، لە دەستوور و سوننەتی خودا دا ، ئاوا دانـراوە کـە مرۆڤەکان سەربەست بن و ئـازار بـچێژن بـەڕێزتر و پایـەدارترە بۆیـان لـەوەی کە هەردەم خەریکی عیبادەت بن و لە ئاسودەیی و خۆشیدا بژین. هەر لە بەر ئەمەش، ڕێمان پێدراوە هەڵە بکەین و، تاوان ئەنجامبـدەین و ئـازار بـچێژین و فێربین، ئەمەیە مەبەست لە ڕێپێدان بۆ کاری خراپ.
لە ژێر ڕۆشنایی ئەم ڕاستیانە بۆمان دەردەکەوێت کـە کـاری چاك بنـەڕەتی و هەمیشەیی یە، هەروەها کاری خراپ کاتی و نا هەمیشەییە.....
کەواتـە تەنـدروستی بنـچینەیە و نەخۆشـی کاتییـە. ئێمـە زۆربـەی ڕۆژەکـانی ژیانمــان بــە تەنــدروســتی دەبەینــە ســەر. بــەڵام نەخۆشــی چــەند ڕۆژێــك دەخایەنێ، هەروەها زەوی لەرزین و گڕکان و ڕوودانی شەڕ چەند کاتێکی کـەم ڕوودەدەن و دووبارە ژیان دەگەڕێتەوە باری ئاسایی خۆی، کە ئەویش خۆشی و ئارامییە، بەدرێژایی تەمەنی زەوی.
لەگەڵ ئەمەشدا، دەبینین ئەم ڕووداو و نەخۆشیانە لایەنێکی چاکەیان هەیـە، بـۆ نموونــە، نەخۆشــی بــەرگری لــە پــاش خــۆی بــەجێ دێڵێــت بــۆ لاشــە، ئازارچەشتن مرۆڤ فێری خۆڕاگری و ئارامگرتن دەکات، زەمینەلەرزەکان ڕووی

گۆی زەوی دەپارێزن، لەو پاڵەپەستویەی کە لە ژێر زەویدا هەیە و ناهێڵێت تەقینەوە دروست ببێت و چیاکان لە شوێنی خۆیان جێگیردەکات. گڕکانەکان هەرچی کانزا پیسەکانی ژێر زەویە دەردەکات و خاکێکی بە پیت دروست دەکات. ڕوودانی شەڕ و نائارامی خەڵك دەکات بە کۆمەڵ کۆمەل و هاوپەیمانی لە نێوانیان دروست دەکات.....نەتەوە یەکگرتووەکان، ئەنجومەنی ئاسایش، دادگای نێودەولەتی ..... هەرچی داهێنانی گەورەیە لە ڕووی زانستییەوە کە سوود بە مرۆڤایەتی بگەیەنێت لەکاتی جەنگ و پێویستیدا داهێنراون، پەنسلین، گەردیلە، چەکی پێشکەوتوو، باڵە فڕ..... هتد.

هەروەها لە ژەهر دەرمان دروستکرا، لە میکروبیش دەرزی سوودبەخش دروستکرا....... ئەگەر ئەوانەی لە پێشمان بوون مردنیان بەسەردا نەهاتبایە، ئێمە شوێنمان نەدەبوو، پلەوپایەی گەورەمان بەدەست نەدەهات. کەواتە خراپەکاری لەم گەردوونە وەك سێبەری سەر وێنەیە ئەگەر لێی نزیك ببینەوە وا هەست دەکەین کەموکورییەکە لە وێنەکەیە، بەڵام ئەگەر لێی دووربکەوینەوە تەماشای هەموو وێنەکە بکەین ئەوجا دەزانین کە ئەم سێبەرە پێویستە، ئەرکێك ئەنجامدەدات وجوانییەك بە وێنەکە دەبەخشێت... ئەگەر نەخۆشیش نەبوایە ئێمە مانای ڕاستەقینەی تەندروستیمان نەدەزانی، کەواتە تەندروستی وەکو تاجێکە بەسەرمانەوە، هەست بە نرخ و پایەیەی ناکەین تەنها لەکاتی ناخۆشیدا نەبێت...... بەهەمان شێوە، هەستمان بە جوانی نەدەکرد ئەگەر ناشیرینی نەبوایە، هەروەها هەستمان بە ئاسایی و سروشتی شتەکان نەدەکرد ئەگەر شتی نامۆ نەبوایە. بۆ ڕاستکردنەوەی ئەم مەبەستە (ئەبو حامدی غەزالی) دەڵێت: هەبوونی کەموکوڕی لە گەردوون

بەڵگەیە لەسەر تەواوی (کمال)ی ئەم گەردوونە. وەکو خواری و لاری کەوانی تیرهاوێـژ، هـەمان نیـشانەی تـەواوەتی ئـەم کەوانەیـە، ئەگـەر ڕاسـت بوایـە نەیدەتوانی تیر بهاوێژێت.

ئەرکێکی تری چەشتنی ئێش و ئازار ئەوەیە کە خەڵکی باش و ئارامگر بە دیـار دەخـات و فێـری خۆڕاگرییـان دەکـات. ئەگـەر بـارگرانی نەبوایـە هـەموو خـەڵك لـە خۆشـیدا دەژیـان..... مەردایـەتی و زۆربەخـشین نـەداری و هـەژاری پەیـدا دەکـات......بـەرەو شەڕچوون تاقیکردنەوەیـە خۆمـان پـێ دەناسـرێین، تاقیکردنەوەیە کە پلە و پایەمان پێ دیار دەبێت لە لای خودای گەورە........

کەواتە دونیا تەنها بەشێکە لە ڕۆمانێکی پێکهاتوو لـە چـەند بـەش. مـردنیش کۆتایی ئەم ڕۆمانە نییە، بەڵکو سەرەتاکەیەتی.....

ناکرێت ئێمە بڕیار لەسەر شانۆگەرییێك بدەین کە لە یەك بەش پێك هاتبێت، هـەروەها نابێـت ئێمـە کتێبێـك ڕەت بکەینـەوە چونکە لاپـەڕەی یەکـەمی بـە دڵمان نـەبوو...... ئەمـە بڕیـارێکی تـەواو نییـە، پەنـد و مەبەسـت تـەنها لـە کۆتایی شتەکان بە تەواوی دیاردەکەوێت......

کەواتە ئەوەی گاڵتـەمان پێـدەکات بـۆ هـەبوونی ئەم واقیعـە، ئایا جێگـرەوەی هەیە، ئایا شتێکی باشتری پێیە ؟. ئایا دەیەوێت ژیانێکی هەبێت بـەبێ مـردن، بەبێ نەخۆشی، بەبێ پیربوون و ئاستەنگ و ئێش و ئازار ؟!

ئایا داوا دەکات مرۆڤێکی تەواو بێت لە هـەموو ڕووێکـەوە ؟! بـەڵام تەواویـەتی تـەنها بـۆ خودایـە، تـاکی و تـەواوی تـەنها یەکـە نابێـت بـە زۆر ....... ئایـا دەیەوێت ناتەواوی خۆی تەواو بکات بە تاکێکی تەواو ؟!

کەواتە هاوڕێکەمان دەیەوێت ببێت بە خودا، کە ئەمەش دەستدرێژییە بۆ سەر زاتی خودا...... ڕاوەستە با ئێمەش هەندێك گاڵتە بەم جۆرە کەسانە بکەین ، ئەوانەی کە هیچیان نەکردووە و دەیانەوێت ژیانیان هەمووی بەهەشت بێت، باشە ئەمانە چیان کردووە بۆ ئەوەی شایەنی ئەوە بن ژیانیان بەهەشت بێت ؟!

هاوڕێکەمان چی پێشکەش بە مرۆڤایەتی کردووە بۆ ئەوەی خۆی بکات بە خودای گەورە. کە بە شتەکان دەڵێت ببن، یەکسەر دەبن ؟! داپیرەکەم زۆر زیرەکترە لەو پزیشکەی کە لە فەرنسا دەرچووە...... چونکە داپیرەکەم هەردەم دەڵێت: (چاکە لە لای خوداوەیە، خراپەکاری لە لای ئێمەوەیە )، چەند وشەیەکی کورتن، بەڵام پرمانان و ئاریشەکەمان زۆر بە ئاسانی بۆمان چارەسەر دەکات.

خودای گەورە هەوای ناردووە و جوڵەی بە ئاوی ڕووباریش بەخشیوە، بەڵام کەشتیوانی کەشتییەك ئەوەندە چاوچنۆکە، کەشتیەکە پڕ دەکات لە خەڵك و کەلو پەل، کە باری کەشتییەکە زیاد دەبێت و لەناو دەچێت بە قەدەری خودا....... ئایا لێرە خودای گەورە تاوانی چییە کاتێك هەوا دەنێرێت و ئاویش دەجوڵێنێت......؟!

بەڵکو تەنها چاوچنۆکی مرۆڤەکانە کە ئەم چاکە دەگۆڕێت بۆ خراپە..... خودایە وشەکانی داپیرەم چەند جوانن: (چاکە لەلای خوداوەیە، بەدیش لە لای مرۆڤەکانەوەیە).

# بـــــەشی چوارەم

## - ئایا تاوانی ئەو کەسە چیە کە قورئانی پێنەگەیشتووە ؟!

دکتۆری هاوڕێم سەری هەژاند، دیاربوو لەناو نامەی دکتۆراکەی دەگەڕا بۆ ئەوەی کەلێنێك یان درزێك بدۆزێتەوە و یەخەم پێبگرێت، پاش ماوەیەکی زۆر بە هێواشی گوتی: باشە ڕات چوونە لەبارەی ئەو کەسەی کە قورئانی پێنەگەیشتووە و هیچ پەرتووکێك یان پێغەمبەرێکی بۆ نەهاتووە، ئەو کەسە تاوانی چییە.....؟ لە ڕۆژی دوایی چارەنووسی چۆن دەبێت.....؟ وەکو ئەو خەڵکانەی لە هەردوو جەمسەری زەوی دەژین، یان ئەو ڕەشپێستانەی کە لەناو دارستان دەژین.....؟ ئەم جۆرە کەسانە چ جۆرە چارەنووسێك چاوەڕێیان دەکات.......؟

من پێم گوت: لێم گەڕێ تا زانیاریەکانت ڕاستبکەمەوە، قسەکانت بە پێشەکییەکی نادروست دەستپێکرد... چونکە خودای گەورە پێمان دەڵێت هیچ کەسێك بێبەش نەکراوە لە بەزەیی و سروش و وشە و بەڵگەکانی خۆی، لە

سـورەتی فـاطر دەفـەرموویت:﴿ إِنَّآ أَرۡسَلۡنَٰكَ بِٱلۡحَقِّ بَشِيرٗا وَنَذِيرٗاۚ وَإِن مِّنۡ أُمَّةٍ إِلَّا خَلَا فِيهَا نَذِيرٞ ﴾ فاطر(٢٤). واتە: (بێگومان ئێمە تۆمان رەوانکردووە بـە حـەق و راسـتییەکی تـەواوەوە، تـۆ مـژدەدەری ( ئیمانـدارانیت)، ترسـێنەری ( بـێ بڕواکانیـت) هـیچ گـەل و نەتەوەیـەکیش نـەبووە کـە فرسـتادە و بێدارکەرەوەیـەکی بـۆ راوانـە نـەکرابێت) هـەروەها لـە سـورەتی النحـل دەفـەرموویت:﴿ وَلَقَدۡ بَعَثۡنَا فِي كُلِّ أُمَّةٖ رَّسُولًا أَنِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ وَٱجۡتَنِبُواْ ٱلطَّٰغُوتَۖ ..... ﴾ النحل(٣٦). واتە: (بێگومان ئێمە بۆ هەر گەل و نەتەوەیەکدا پێغەمبەرێکمان رەوانە کـردووە و پێمـان ڕاگەیانـدووە کـە پێیـان بڵێـت: تـەنها خوا بپەرستن، خۆتان دووره پەرێز بگرن لە هەموو پەرستراوێکی تر).

پێغەمبەرەکانیش تەنها ئەوەنـدە نـین کـە ئێمـە دەزانـین و ناویـان لـە قورئـان هـاتووە، بـەڵکو بـە هەزارەها پێغەمبـەری تـر هـەن ئێمـە شـتێك لەبارەیانـەوە نازانین، هـەر وەکو لـە سورەتی غـافر هـاتووە و دەفـەرموویت:﴿ وَلَقَدۡ أَرۡسَلۡنَا رُسُلٗا مِّن قَبۡلِكَ مِنۡهُم مَّن قَصَصۡنَا عَلَيۡكَ وَمِنۡهُم مَّن لَّمۡ نَقۡصُصۡ عَلَيۡكَۗ .... ﴾ غـافر:(٧٨).واتـە: (بـە ڕاسـتی ئێمـە پـێش تـۆ پێغەمبـەرانی تریـشمان رەوانـەکردووە، هەیانـە سەرگوزەشـتە و بەسـەرهاتیانمان بـۆ گێڕاویتـەوە، هەشیانە کە سەر گوزەشتە و بەسەرهاتیمان بۆ نەگێڕاویتەوە).

خـودای گـەورە بـۆ هـەموو شـتێك سـروش دەنێرێـت، بـۆ نموونـە: لـە سـورەتی النحـل باسـی هـەنگ دەکـات و دەفـەرموویت:﴿ وَأَوۡحَىٰ رَبُّكَ إِلَى ٱلنَّحۡلِ أَنِ ٱتَّخِذِي مِنَ ٱلۡجِبَالِ بُيُوتٗا وَمِنَ ٱلشَّجَرِ وَمِمَّا يَعۡرِشُونَ ﴾ النحل(٦٨). واتە: ( پەروەردگاری تۆ ( ئەی

ئینسان) نیگا و ئیلهامی کردووە بۆ هەنگ کە جێگە بۆ خۆی ساز بکات لە کون و کەلێنی چیاکاندا، هەروەها لە کەلەبەری درەختەکان و لەو شوێنانەی کە ئادەمیزاد بۆی ئامادە دەکات).

سروشیش جۆراوجۆرە، لەوانەیە ناردنی کتێب بێت بەهۆی جبرپلەوە، لەوانەشە پەند و رووناکییەك بێت بخاتە سەر دڵی بەندەکانی، بەڵکو لەوانەیە ترسان و تێگەیشتنێك بێت، هەریەك لە ئێمە ئەگەر دڵ و ئەندامەکانی هەستکردن بخەینە بارێکی سروشتییەوە و بیر لە خودای گەورە بکەینەوە، هەندێك نهێنی ڕاستەقینە بۆمان دەردەکەون. لەگەڵ ئەمەش ئەوانەی گوێ و دڵیان دەگرن و بیرناکەنەوە، هیچ کتێب و پێغەمبەرێك سوودیان پێ ناگەیەنێت.

خودای گەورەش هەندێك کەس هەڵدەبژێرێت بۆ ئەوەی ببن بە پێغەمبەر و هەلگری بەرنامەی ئەو ...... کەسیش ناتوانێت بپرسێت بۆچی خودا ئەوەی هەڵبژارد، ئەوەی تری هەڵنەبژارد، یان لێپێچینەوەی لەگەڵدا بکات.

کێ دەزانێت لەوانەیە ئاوەڕدانەوە و ڕوو لە ئاسمان کردنی کەسێکی پێسترەشی دواکەوتوو لە بیروباوەڕ، کاتێك بە ترسەوە ڕوو لە ئاسمان دەکات؛ لای خودا زۆر باشتر بێت لە نوێژەکانی ئێمە. چونکە کاتێك بە وردی لێکۆڵینەوە دەکەین لەسەر بیروباوەڕی هەندێك گەلانی کۆن و زۆر دواکەوتوو لە پێسترەشەکان دەبینین ئەوانە بڕوایان بە پێغەمبەران و خودای ئاسمان هەبووە. بۆ نموونە قەبیلەی (مادماد) باوەڕیان بە خودایەك هەیە بەناوی (موجایی)، بە ڕای ئەوان خودایەکە لە کەس نەبووە و کەسیش لە ئەو نابێت، پاك و تەنیایە و وەکو مرۆڤەکان نییە، کەس نایبینێت و هەست پێ ناکات،

تەنها بە شوێنەوار و کردەوەکانی ئەو نەبێت...... دروستکەر و بەخێوکەر و بەبەزەییە. نەخۆشی چارەسەر دەکات و مرۆڤی گرفتار و ئاریشەدار رزگار دەکات، باران دەبارێنێت و نزاکان قەبوول دەکات....... هتد.

باشە ئەم (موجایی) یە هەمان خودای خۆمان نییە...... ئەم بیروباوەڕە لە کۆنەوە بۆیان هاتووە....... ئەگەر پێغەمبەریان بۆ نەهاتبێت و بەدرێژایی رۆژگار گۆڕانکاری بەسەردا نەهاتبێت؟ گومانی تێدا نییە بیروباوەڕی ڕاستەقینەیان هەندێك بت پەرستی و شتی ئەفسانەیی لەگەڵ تێکەڵ بووە.

وە قەبیلەیەکی تر بەناوی (نیام نیام) باوەڕیان بە خودایەك هەیە بەناوی (میولی) و، دەڵێن هەموو شتێك لە دارستانەکان بە ویستی ئەو دەجولێت..... مرۆڤە خراپەکان بە بروسکە لەناو دەبات و مرۆڤە چاکەکان پاداشتی چاکیان دەداتەوە........

هەروەها قەبیلەی (شیلوك) باوەڕیان بە خودایەك هەیە بەناوی (جوك)، وە دەڵێن (جوك) خودایەکی بەرز و دیارە ........ ئەو لە ئاسمانە و، لە هەموو شوێنێکە و دروستکەری هەموو شتێکە........

هەروەها قەبیلەی (دنکا) باوەڕیان بە خودایەك هەیە بەناوی (نیالاك)، وەرگێڕانی تەواوی ئەم وشەیە مانای (خودای ئاسمان) یان (خودای گەورە) دەگەیەنێت....... ئەوانە هەموویان بەڵگەن کە ئایینی مرۆڤەکان هەریەك بووە کە ئەویش ئیسلامە....... ئەمانە هەموویان گەلانێکن خاوەن پێغەمبەر و بەرنامەی خودا بووینە، بەڵام گۆڕانکارییان بەسەردا هاتووە.......

خودای گەورە لە سورەتی البقرة دەفەرموویت:﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَٱلَّذِينَ هَادُواْ وَٱلنَّصَٰرَىٰ وَٱلصَّٰبِـِٔينَ مَنْ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ وَعَمِلَ صَٰلِحًا فَلَهُمْ

﴿ أَجْرُهُمْ عِندَ رَبِّهِمْ وَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴾ البقـــره(٦٢). واتـــه: ( بێگومان ئەوانەی باوەڕیان هێناوە ( لە ئوممەتی محەممەد ( صلی الله علیه و سلم)، ئەوانەش بوونەتە جوولەکە، گاور و صائبە ئەوانە هەر دەستەیەکیان باوەڕی دامەزراوی هێنا بێت بە خوا و ڕۆژی دوایی و کار و کردەوەی چاکەی ئەنجام دابێت، جا ئەوانە پاداشتیان لای پەروەردگاریانە، نە ترس و بیمیان دەبێت، نە غەم و پەژارەش ڕوویان تێدەکات).

کەواتە هەتا ئەوانەی سابیئەن و خۆر دەپەرستن وەکو بەڵگەیەك لە بەڵگەکانی هەبوونی خودا، باوەڕیان بە دوارۆژ و زیندووبوونەوە هەیە پاداشتی خۆیان هەیە لە لای خودا.

هەندێك کەس لە دایك دەبن و نابینا(کوێر)ن، هەندێکیان دونیا دەبینن. هەندێك لە سەردەمی موسا ژیاون و بە چاوی خۆیان بینییان چۆن موسا دەریای کرد بە دوو پارچەوە، هەندێکیان لە سەردەمی عیسا ژیاون و بە چاوی خۆیان بینییان چۆن مردووی زیندوو کردەوە........ بەڵام ئێمە هیچ شتێکمان نەدیوە تەنها گوێمان لێبووە، کەواتە ئەوەی دەبینێ وەکو ئەو کەسە نییە کە دەبیستێ، بەڵام لەگەڵ ئەوەش باوەڕهێنان بەند نییە لەسەر دیتنی موعجیزەکان، زۆر کەسیش هەبووە خۆی بە گەورە زانیوە، باوەڕی بە پێغەمبەری سەردەمی خۆی نەهێناوە، بەڵکو دەیگوت ئەمە هەمووو جادوو و درۆیە. گومانی تێدا نییە دکتۆری هاوڕێم کە لە فەرەنسا هاتووە، زانیاری لەبارەی هەرسێ کتێب (تەورات، ئینجیل و قورئان) هەیە، بەڵام لەگەڵ ئەوەش زیاتر گوماناوی بووە........ بۆ ئەوەی خۆیشی لەم ڕاستییە ڕزگار بکات. پرسیارمان لێ دەکات و خۆی لە بیر دەکات. لەبارەی مرۆڤێکی نادیار

که له دارستان دەژی که پێغەمبەری بۆ نەهاتووە، ئایا ئەم جۆرە مرۆڤانە تاوانیان چییە کە قورئانیان پێنەگەیشتووە، مەبەستیش هەر ئەوەیە کە بیسەلمێنێ ئەوە هەمووی ڕاست نییە، هەروەها خودا دادپەروەر نییە ؟!!

هەروەها پرسیارمان لێدەکات و دەڵێت: بۆچی میهرەبانی خودا بۆ هەموو کەس وەکو یەك نییە ؟! بۆچی بۆ یەکێکیان بەڵگە و موعجیزە دێنێت و هەندێکیان تەنها گوێیان لێدەبێت؟!

ئێمەش وەڵامی دەدەینەوە و دەڵێین: ئەمە لەوانەیە میهرەبانی نەبێت، بەڵکو ئێش و ئازار بێت؟ باشە خودای گەورە بە هاوڕێیانی عیسای ڕانەگەیاند ئەوانەی کە داوایان کرد خودای گەورە خواردنیان لە ئاسمانەوە بۆ بهێنێتە خوارەوە. ئاگاداریان دەکات و دەفەرمووێت:﴿ قَالَ ٱللَّهُ إِنِّي مُنَزِّلُهَا عَلَيۡكُمۡۖ فَمَن يَكۡفُرۡ بَعۡدُ مِنكُمۡ فَإِنِّيٓ أُعَذِّبُهُۥ عَذَابٗا لَّآ أُعَذِّبُهُۥٓ أَحَدٗا مِّنَ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴾ المائـــــــدە(١١٥).

واتە:(خوای گەورە فەرمووی: بە ڕاستی من ئەو سفرە و خوانەتان بۆ دادەبەزێنم، جا ئەوەتان ( دوای دابەزاندنی سفرە و خوانەکە) بێ بڕوابێت و سوپاس ناپەزێربێت، بە بەڕاستی من سزایەکی دەدەم کە سزای هیچ کەسێکم لە جیهاندا ئاوا نەدا بێت)...... چونکە هەردەم لەگەڵ هاتنی موعجیزەکان توندی و ئاگادارکردنەوە هەبووە بۆ ئەو کەسەی کە بڕوا نەهێنێت........ کەواتە مزگێنی بۆ ئەو کەسە کە تەنها گوێی لێبووە بەبێ ئەوەی موعجیزەی بۆ هاتبێت. ئازار و ناخۆشیش بۆ ئەو کەسانەبێت کە موعجیزەیان دیوە و باوەڕیان نەهێناوە. کەواتە هاوڕێیەکەم ئەو قورئانەی لە دەستی خۆتە بەڵگەیە لە سەرت و ئاگادارکەرەوەیە، ڕۆژی دوایش دەبێتە ئێش و ئازار نەك میهرەبانی.......

نەگەیاندنی ئەم بەڵگەیە (قورئان) بۆ ئەوانەی لە هەردوو جەمسەری زەوی دەژین لەوانەیە لێخۆشبوونێك و لێبوردنێك بێت بۆ ئەوان، هەروەها لەوانەشە ئاوەڕدانەوەیەکی ئەم کەسانە بۆ ئاسمان، کەوا زۆر نەزانن، ببێتە مایەی عیبادەتی خودا بەدرێژایی تەمەنیان و خودا لێیان قەبوول بکات!.

لەبارەی پرسیارەکەت ئایا بۆچی بەزەیی و میهرەبانی خۆی زیاتر بەهەندێ کەس دەبەخشێت لە هەندێکی تر؟، دەڵێین: ئەمە شتێکە پەیوەستە بە زانستی خوداوە بۆ دڵی مرۆڤەکان.

هەروەها زانستی خودا لەبارەی ئێمە و دڵ و دەروونمان دەگەڕێتەوە بۆ پێش دروستبوونمان لەناو سکی دایك، کاتێك کە ئێمە ڕۆح بووین لە قۆناغی گەردیلەیی....... هەر سۆفیەکان دەڵێن: لەو کاتەوە ئەو ڕۆحانەی نزیك بوونەوە لە نور و ڕووناکی خودا، ئێستا لە خۆشی و ئارامیدا دەژین، بەڵام ئەوانەی لە نور و ڕووناکی خودا دوورکەوتنەوە ئێستا توشی ئازار و ناخۆشی دەبن........

ئەمەی کە ئێستا لە مێژووی مرۆڤایەتی زانیومانە هەموو شتێك نییە، کەواتە دوورکەوتنەوە و نزیکبوونەوەی مرۆڤەکان لە میهرەبانی خودا شتێکە ئێمە زۆر شت لەبارەیەوە نازانین، بەڵکو پەیوەندی بە زانستی خوداوە هەیە.

ئەوەی کە پرسیارم لێدەکات و دەڵێت بۆچی خودا بەرازی بە بەراز دروست کردووە؟ هیچ وەڵامم پێ نییە تەنها دەڵێم بەراز بە بەراز دروستکراوە، چونکە ڕۆح و ناخی بەرازە. هەروەها دروستکردنی بەراز بەم شێوەیە ڕاستی و دادپەروەرییە.

هەموو شتێکی دەوروبەریشمان بەم شێوازەی داناوە دیسان دادپەروەرییە، زانینی پەند و مەبەستیش لەبارەی ئەو شتانەوە کارێکە لە توانای ئێمەدا نییە..... لەوانەیە پەیوەندی بەوەوە هەبێت کە ڕۆژی دوایی هەیە، ئەو ڕۆژەی کە خودای گەورە پێمان ڕادەگەیەنێت هۆکاری ناکۆکیمان لەسەر ڕاستییەکان. لەگەڵ ئەوەشدا پێت ڕادەگەیەنم وشەی کۆتایی و جیاکەرەوە کە ئەویش خودا دەفەرموێت هیچ کەسێك ئازار نادەم بەبێ ناردنی پێغەمبەر، هەروەکو لە سورەتی الأسراء دا هاتووە:﴿ مَّنِ ٱهۡتَدَىٰ فَإِنَّمَا يَهۡتَدِي لِنَفۡسِهِۦۖ وَمَن ضَلَّ فَإِنَّمَا يَضِلُّ عَلَيۡهَاۚ وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٞ وِزۡرَ أُخۡرَىٰۗ وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّىٰ نَبۡعَثَ رَسُولٗا ﴾ الإسراء(١٥).واتە: (ئەوەی هەوڵی دابێت ڕێبازی راست و دروست بگرێت، ئەوە بە ڕاستی بە قازانجی خۆی تەواو دەبێت و هەر خۆی بەهرە لە هیدایەتەکەی وەردەگرێت، ئەوەش گومرا بووە و ڕێبازی سەرلێشێواوی گرتۆتەبەر، ئەوە بێگومان هەر خۆی زەرەر دەکات و گومراییەکەی لەسەری دەکەوێت، کەس گوناهی کەس هەڵناگرێت، کەس بەرپرسیار نییە لە هەڵەی کەسانی تر، ئێمەش سزای کەسمان نەداوە تا پێغەمبەرێکی بۆ دەنێرین).

ئایا بەم قسانە حاڵی و ئارام بووی ؟!

کاتم بدەرێ با ئەوەشت پێ بڵێم....... سەیرترین شت لە پرسیارەکەت ئەوەیە، کە پەرۆشت بۆ ئەو کەسە ڕەشپێستە دەچێت کە بڕوای نەهێناوە. چونکە قورئانی پێنەگەیشتووە. بەڵام خۆت بڕوات بە قورئان و میهرەبانی و ڕووناکی نییە، ئایا پرسیارەکەت فێڵبازی و تۆمەت و لادان نییە........ فێڵ لە خۆت دەکەی و دەتەوێت بەڵگەیەکمان لەسەر دروست بکەی کە لە ڕاستیدا بەڵگەیە

لەسەر تۆ ...... دەیکەی بە بەڵگە و لای خۆشت بەڵگە نییە ؟! کەواتە ئامێر و دەزگای بیرکردنەوە لای هاوڕێیەکەم پێویستی بە چاککردنەوە هەیە !.

# بــــەشی پێنجەم

## -بــەهەشت و دۆزەخ

ئەم جارە هاورێیەکەم زۆر لە خۆی پشتڕاست بوو کە دەتوانێت بەسەرم دا زالبێت و بە هێواشی گوتی: چۆن خودای گەورە، میهرەبان و بە بەزەییە لەگەڵ ئەوەشدا لەسەر تاوانێکی بچووك ئازارمان دەدات، لەکاتێکی دیاری کراودا بە ئاگرێکی هەتا هەتایی؟! ئێمە چین بەرامبەر بە گەورەیی خودا تا تۆڵەمان لێ بسێنێتەوە ؟!.... مرۆڤیش تەنها گەردیلەیەکی زۆر بچووکە لەم گەردوونە بەرامبەر گەورەیی خودا، ئێمە زۆر لە ئەو کەمترین، بەڵکو هیچ نین.......

منیش یەکەم جار هەوڵدەدەم زانیاریەکانی دکتۆر ڕاستبکەمەوە:

ئێمە گەردیلەیەکی بچووك نین لەم گەردوونە، بەڵکو ئێمە پلە و پایەیەکی زۆر گەورەمان هەیە لە لای خودای گەورە...... ئایا خودای گەورە لە ڕۆحی خۆی فوی لە ئێمە نەکرد ؟!.... ئایا فریشتەکان کڕنۆشیان بۆ ئێمە نەبرد ؟!..... ئایا پاشماوەی زەوی و ئاسمانی بۆ ئێمە بەجێنەهێشتووە ؟!....ئایا

خـــوداى گـــەورە نافـــەرمووێت:﴿ وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِىٓ ءَادَمَ وَحَمَلْنَٰهُمْ فِى ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ وَرَزَقْنَٰهُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَفَضَّلْنَٰهُمْ عَلَىٰ كَثِيرٍ مِّمَّنْ خَلَقْنَا تَفْضِيلًا ﴾ الإسـراء (٧٠). واتە: (ئێمە ڕێزمان لە نەوەی ئادەم گرتووە و بەسەر وشـکانی و دەریـادا ( بە جۆرەها هۆکاری گواستنەوە) هەڵمان گرتوون و لـە رزق و ڕۆزی پوخـت و پـاکی و جۆراوجـۆر بـەهرەوەرمان کـردوون، بـە ڕاسـتی ئێمـە ڕێـزی زیـادەی ئەوانمان داوە بەسەر زۆربەی بەدی هێنراوانـەدا کـە دروسـتمان کـردوون)......

کەواتە لە ئێمەی مرۆڤدا ڕۆحی خودا هەیە...... ئێمە بەرامبـەر بـە گـەردوون گەردیلە و شتێك و ماددەیەك نین..... ئێمە بە جەستەی خۆمان بەرامبەر بـە گەردوون گەردیلەین یان تەنێکین........ بەڵام ئایا ئەم جەستەیە شتێکی لەناو نییە بەناوی عەقڵ کە هەموو شت و یاساکانی ئـەم گەردوونـە پـێ دەناسـین ؟ ئایا زۆربەی ئەو بۆچوونانەی کە هەمان بوون و بە عەقڵمان زانیـوون زانـستی ئەم سەردەمەی نە سەلماندووە ؟...... ئایا ئەمە بەڵگە نییە کە ئێمە بە ڕۆحـی خۆمـان لـەم گەردوونـە گـەورەترین؟ ئایـا شـاعیر ڕاسـتی نـەگوتووە کاتێـك بـە مرۆڤ دەڵێت: تۆ وا هەست دەکەی تـەنها تـەنێکی بچووکی ، بـەڵام لـە ڕاسـتیدا ئەم جیهانە گەورەیە لە تۆدا کۆبووتەوە!!

هەروەکو سۆفیەکان دەڵێن: مرۆڤ وەکو کتێبێکە کە هەموو زانیاریەکان لە خـۆ گرێتبێت و گەردوونیش پەڕەکانی ئەم کتێبەن.....

ئەگەر مرۆڤ بە حاڵی خۆی گەورە بێت و ترسناکیش بێت، وە لە ڕۆحـی خـودا بێت و، سزا و پاداشت پەیوەست بێت بە کردەوەکانیەوە....... کەواتە دکتۆری هـاوڕێم ئـەوەی زۆر بـڕوای بـە خـۆی هەیـە، کاتێك کـە دەڵێـت بۆچـی لەسـەر تاوانێـــك خـــودای گـــەورە بـــە ئـــازارێکی هـــەتا هـــەتایی ســـزامان دەدات

هەڵخەلەتانێکی تـرە. خـودای گـەورە لـەبارەی ئەوانـەی تـاوان ئـەنجام دەدەن و سـزای هـەتا هـەتایی وەردەگـرن و داوای گەڕانـەوە دەکـەن بـۆ دونیـا بـۆ ئەنجامـدانی کـاری چـاکە دەفـەرمووێت:﴿ .... وَلَوْ رُدُّوا لَعَادُوا لِمَا نُهُوا عَنْهُ وَإِنَّهُمْ لَكَاذِبُونَ ﴾ الانعام(٢٨). واتە: (....خۆ ئەگەر بگێڕدرێنەوە بۆ (دنیا) ئەوە هەر دەست دەکەنەوە بەو کار و کردەوانەی کە جاران دەیانکرد، بە ڕاستی ئەوانە هەر درۆ دەکەن و درۆزنن).

کەواتە تاوانیان تاوانێکی بچووك و لە کاتێکی دیاریکراو نییە، بەڵکو سیفەت و کارێکە لە هەموو کاتەکان دووبارە دەبێتەوە، وەکو لاپەڕەیەکی هـەرە زینـدووە لە ناو ناخیان، نەك هەڵەیەکە لە کاتێکی دیاری کراو لە دونیا........

لە شوێنێکی تر خودای گەورە باسیان دەکات و دەفەرمووێت:﴿ يَوْمَ يَبْعَثُهُمُ اللَّهُ جَمِيعًا فَيَحْلِفُونَ لَهُ كَمَا يَحْلِفُونَ لَكُمْ وَيَحْسَبُونَ أَنَّهُمْ عَلَىٰ شَيْءٍ ۚ أَلَا إِنَّهُمْ هُمُ الْكَاذِبُونَ ﴾ المجادله(١٨). واتـە: (لـەو ڕۆژەدا کـە خـوا هـەموویان زینـدوو دەکاتـەوە، دەسـت دەکەنەوە بە سوێند خواردن هەروەك بۆ ئێوە سوێندیان دەخوارد، لـە کاتێکـدا وا دەزانن کە ڕزگاریان دەبێت و شتێکیان دەست دەکەوێت!! ( خوای گـەورە لـە ناو خەڵکدا ڕیسوایان دەکات و دەفـەرموێت): ئاگادار بـن کـە بـە ڕاسـتی هـەر ئەوان درۆزنن).

ئەمە ڕەنگێکی تـرە لەسـەر سووربوون لەسـەر شـتی نـاڕەوا، بـەرەنگاری خـودا دەبنەوە لە ڕۆژێك کە هـەموو شـتە شـاراوەکان ئاشـکرا دەکـرێن. درۆ دەکـەن و سوێند بە درۆ دەخۆن، کە ئـەمـەش کۆتـایی نـاڕەوایی و بەدڕەوشـتییە، کەواتـە تاوانیـان بـچووك نییـە، کـە لـە کـاتێکی دیـاریکراودا دەکـرێن، بـەڵکو تـاوانێکی

بەردەوامە بە درێژایی رۆژگار لەدوای تەواوبوونی رۆژگاریش....... ناخێکە تاوانێکی هەتا هەتایی لە خۆ دەگرێت....... هەر ئەمەش باشترین بەڵگەیە گەوا ئازاردانی ئەم جەستە و ناخە دادپەوەرییە....... هەر لەبەر ئەمەش ئایەتەکە دەربارەیان دەڵێت:﴿ .....وَمَا هُم بِخَٰرِجِينَ مِنَ ٱلنَّارِ ﴾ البقرە(١٦٧).
واتە:(...بە ڕاستی ئەوانە هەرگیز لە دۆزەخ دەرچوونیان نییە).
بەزەییش بۆ ئەمانە لەسەر ژیانی ناو دۆزەخ ڕادێن....گونجانێك لە نێوان ئەوان و ئاگر پەیدا دەبێت، بەڵکو ئەم ناخانە لە ڕاستیدا ئاگرێکن لە توندی و کینە و تووڕەیی و نابەزەیی و ستەمکاری و هەستی دوژمنکاری، کە دەڵێی هەر لە خودی خۆیدا ئاگرە.
ئەم جۆرە ناخانە ناتوانن لە ئاشتیدا بژین..... ناتوانن ساتێکی کەم لە ئارامیدا بژین، بەڵکو بەردەوام شەڕ و ئاژاوە و ئاگر پەیدا دەکەن. چونکە دۆزەخ شوێن و سروشتی خۆیانە...... ئەم ناخانە جێگایان لە ئاگردایە و بڕیارێکی دادپەروەرانەیە، هەروەکو چۆن شتێك لە شوێنی ڕاستەقینەی خۆی دابنێی حاڵیان وایە، ئەگەر ئەمانە ببەن بۆ بەهەشت چێژی لێوەرناگرن، ئایا ئەمانە لە دونیا ئاشتییان ڕەت نەدەکردەوە ؟ کەواتە دەبێت ئێمە تێگەیشتنێکی بەرفراوانمان هەبێت بۆ بەهەشت و ئاگر لە رۆژی دوایی......
ئاوا تێبگەین کە ئاگر تەنها سووتان و سووربوونەوە نییە بە مانای دونیایی، بەڵکو خودای گەورە دەفەرموێت: ئەوانەی تاوانبارن قسە دەکەن و دژی یەکتر ڕادەوەستن و، دارێك هەیە لە ناو ئاگر بەناوی داری (زەققوم) لە ئاگردا شینبووە، هەروەها ئاوێکی تێدا هەیە ئازار چەشتووەکان لێی دەخۆنەوە......
کەواتە ئەگەر لەناو دۆزەخ ئاو هەبێت و دار هەبێت و خەڵك قسە بکەن،

دەبێت وەکو ئاگری دونیا نەبێت !! خودا دەفەرموویێت:﴿ ....كُلَّمَا دَخَلَتْ أُمَّةٌ لَّعَنَتْ أُخْتَهَا حَتَّىٰٓ إِذَا ادَّارَكُوا فِيهَا جَمِيعًا قَالَتْ أُخْرَىٰهُمْ لِأُولَىٰهُمْ رَبَّنَا هَٰٓؤُلَآءِ أَضَلُّونَا فَـَٔاتِهِمْ عَذَابًا ضِعْفًا مِّنَ النَّارِ قَالَ لِكُلٍّ ضِعْفٌ وَلَٰكِن لَّا تَعْلَمُونَ ﴾ الاعراف(٣٨). واتە: (هەر کاتێك هەر کۆمەڵ و دەستەیەك دەچنە ناوی نەفرین دەکەن لە هاو ئاین و هاو بیرانیان، هەتا ئەو کاتەی هەموویان کۆ دەکەینەوە و بەسەریەکدا دەدرێن لە ناویدا، شوێنکەوتووەکان ڕوو بە گەورەکانیان دەڵێن: پەروەردگارا ئا ئەوانە ئێمەیان گومڕا کرد، دە تۆش لە ناو دۆزەخدا سزای دوو بەرامبەریان بدە!!( خوای گەورەش فەرمووی): بۆ هەموو لایەك ( سزا و تۆڵە) دوو بەرامبەرە بەڵام ئێوە پێی نازانن).

ئەوانە لەناو ئاگر بەخەبەر دێن، ئاگرێکە بە مرۆڤ و بەردەکان گڕ دەگرێت، ئەم ئاگرە نەبینراوە، بەڵکو هەندێك لە سیفەتەکانی باسکراوە.

ئەم قسەیەمان دەبێت ئاوا تێنەگەن کە من ئازاری جەستە ڕەت دەکەمەوە تەنها بڕوام بە ئازاری مانەوی (معنوی) هەیە. چونکە ئازاری جەستەیی نابێت گومانمان لەبارەیەوە هەبێت، چونکە بەڵگەی روون و ئاشکرامان هەیە لەسەری. بەڵام مەبەستمان ئەوەیە کە وردەکاری و چۆنیەتی چەشتنی ئەم ئازارە، هەروەها وردەکاری دەربارەی ئەم ئاگرە و سیفەتەکانی هەموویان شتی بەزر و نادیارن. ئاگرێکە بەپێی ئاماژەکانی قورئان، وەکو ئاگری ئێستامان نییە. بەهەمان شێوە ئەو جەستەی بەرامبەر بەو ئاگرە خۆڕاگرە هەمان جەستەی خۆڵاوی ئێستامان نییە...... بەهەشتیش بە هەمان ڕێڕەو ئێمە ناتوانین وەکو بازاڕێك تێبگەین کە سەوزە و میوە و هەنار و تری لێیە......

بەڵکو ئەمانە هەموویان چەند سیفەتێکی قورئانین، نموونە و ئاماژەن بۆ ئەوەی بەهەشت لە مێشکمان نزیك بکرێتەوە...... چەند ئایەتێك دێنین کە ئاماژەن بۆ ئەم ڕاستییە، خودای گەورە دەفەرموویت:﴿ مَّثَلُ الْجَنَّةِ الَّتِي وُعِدَ الْمُتَّقُونَ فِيهَا أَنْهَارٌ مِّن مَّاءٍ غَيْرِ آسِنٍ وَأَنْهَارٌ مِّن لَّبَنٍ لَّمْ يَتَغَيَّرْ طَعْمُهُ وَأَنْهَارٌ مِّنْ خَمْرٍ لَّذَّةٍ لِّلشَّارِبِينَ وَأَنْهَارٌ مِّنْ عَسَلٍ مُّصَفًّى وَلَهُمْ فِيهَا مِن كُلِّ الثَّمَرَاتِ وَمَغْفِرَةٌ مِّن رَّبِّهِمْ كَمَنْ هُوَ خَالِدٌ فِي النَّارِ وَسُقُوا مَاءً حَمِيمًا فَقَطَّعَ أَمْعَاءَهُمْ ﴾ محمد(١٥). (مثل الجنة) واتە: ئێمە نموونە و بەڵگە دەهێنین بۆ ئەوەی تێگەیشتن لەبارەی بەهەشتەوە بۆتان نزیك بکەینەوە. نەك ڕاستیەکەی، چونکە ڕاستیەکە شاراوەیە.

﴿ فَلَا تَعْلَمُ نَفْسٌ مَّا أُخْفِيَ لَهُم مِّن قُرَّةِ أَعْيُنٍ جَزَاءً بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ ﴾ السجده(١٧). واتە: (جا هیچ کەس لەو بەختەوەرانە نازانێت چی بۆ هەڵگیراوە و شاراوەتەوە لە ناز و نیعمەتی جۆراوجۆر لای پەروەردگاری، کە چاوان پێی گەش دەبنەوە و بەدیتنی شاد دەبن، لە پاداشتی کار و کردەوەی چاك و پاکیاندا کە ئەنجامیان دەدا). هەروەها لە قورئان هاتووە:

﴿ وَسَارِعُوا إِلَىٰ مَغْفِرَةٍ مِّن رَّبِّكُمْ وَجَنَّةٍ عَرْضُهَا السَّمَاوَاتُ وَالْأَرْضُ أُعِدَّتْ لِلْمُتَّقِينَ ﴾ آل عمران(١٣٣) .واتە: ( بەپەلە بن و پێشبڕکێ بکەن تا دەگەنە لێخۆشبوونی پەروەردگارتان و بە هەشتێك کە پانایيەکەی ئاسمانەکان و زەوی گرتۆتەوە و ئامادە کراوە بۆ پارێزکاران). کەواتە ناکرێت ئەم بەهەشتە وەکو سەوزایەکی سنووردار بێت. هەروەها دەفەرموویت:﴿ وَفَاكِهَةٍ كَثِيرَةٍ لَّا مَقْطُوعَةٍ وَلَا مَمْنُوعَةٍ ﴾ الواقعه(٣٢-٣٣). واتە: (میوەهاتی زۆرو هەمە چەشن،

نەبەروبومی تەواودەبێت، نە قەدەغە کراویشە). دیارە میوەی دونیا تەواو دەبێت و لە خواردنی هەندێکیش ڕێگری دەکرێت.

وە:﴿ لَّا يُصَدَّعُونَ عَنْهَا وَلَا يُنزِفُونَ ﴾ الواقعه(۱۹). واتە: (ئەو شەرابانە نە سەریان پێی دێتە ئێش و نە سەرخۆش دەبن). نەوەك مەی ئەم دونیایە کە مرۆڤ لە هۆش دەبات.

وە:﴿ وَنَزَعْنَا مَا فِي صُدُورِهِم مِّنْ غِلٍّ .... ﴾ الاعـراف(٤٣). واتـە:(هەرچی بوغزو کینەیەك لە دڵ و دەروون و سینەیاندا بوو ئێمە دامان ڕنی)، بە ڕێگایەك خاوێن دەکرێن کە ئێمە نازانین چۆنە. کەواتە بەهەشت شاراوەیە، ئەم قسەمان هیچ خۆشییەکی بەرجەستەکراوی بەهەشت ڕەت ناکاتەوە، چونکە ئێمە بڕوامان بە هەبوونی خۆشییەکانی بەهەشت هەیە بە هەردوو جۆریەوە، جەستەیی و مەعنەوی. هەروەها ئازارەکانی دۆزەخیش بە هەمان شێوە. بەڵام دەمانەوێت دڵنیاتان بکەینەوە کە خۆشی و ناخۆشیەکانی دواڕۆژ چۆنیەتییان شاراوەیە و نەزانراوە. تەنها بڕوامان پێ هەیە و ڕاستیەکەیشی شاراوەیە.

ئازاردانی بەندەکان لە ڕۆژی دوایی زۆری و ستەمکاری نییە لەلایەن پەروەردگارەوە. بەڵکو پاککردنەوە و ناساندن و ڕاستکردنەوە و بەزەییە. خودا دەفەرموویت:﴿ مَّا يَفْعَلُ ٱللَّهُ بِعَذَابِكُمْ إِن شَكَرْتُمْ وَءَامَنتُمْ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ شَاكِرًا عَلِيمًا ﴾ النساء(١٤٧). واتە: (خوا چ پێویستیەکی بە سزادانی ئێوە نییە؟ ئەگەر شوکرانە بژێر و سوپاسگوزاربن و ئیمان و باوەڕی دامەزراوتان هەبێت، خوایش هەمیشە و بەردەوام سوپاسگوزاری بەندە چاکەکانیەتی و زانا و ئاگایە پێیان)، چونکە لە بنەڕەتدا ئازار نییە، بەڵکو دادپەروەرییە.

خودای گەورە بەندەی زانا و بڕوادار سزا نادات، بەڵكو سزا و ئازاردان تەنها بۆ ئەو كەسانەیە كە ڕاستی ڕەتدەكەنەوە و هەموو هەوڵێكی چاكبوونیان سەرنەگرێت، خودا دەفەرمووێت:﴿ وَلَنُذِيقَنَّهُم مِّنَ ٱلْعَذَابِ ٱلْأَدْنَىٰ دُونَ ٱلْعَذَابِ ٱلْأَكْبَرِ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴾ السجدە(٢١). واتە: (سوێند بە خوا ئێمە تاڵاو لە دنیادا دەكەین بە گەروویاندا، بێجگە لە سزای ریشەكەنكردنیان، بۆ ئەوەی هۆش و بیربكەنەوە و بیرێك بكەنەوە و بگەڕێنەوە بۆ لای ئیمان).

بەڵام كاتێك هەموو ڕێگاكان بۆ چارەسەریان سەرنەكەوتن، هەر بەردەوام بوون لەسەر ڕەتكردنەوە. لەو كاتە دەبێت تووشی ئازاری ڕاستەقینە ببن، بۆئەوەی لە ڕاستی تێبگەن، لە ڕاستی تێگەیشتنیش خودی خۆی بەزەییە، بەڵام ئەگەر ئەمانە پشتگوێ بخرێن و بەردەوام بن لەسەر كارە خراپەكان، لەوكاتە ستەمیان لێدەكەین..... ناكرێت خودای پاك و تەنیا ستەم بكات...... كەواتە ئازار چەشتنی ئەم جۆرە كەسە نەفامانە پارێزگارییە..... چونكە هەموو كارەكانی خودا بەزەییە، مرۆڤی نەزان و نەفام بەزەیی پێ دەبات بە ئاگر وەك ئامۆژگاری و فێركردن، مرۆڤی زاناش پاداشتی دەداتەوە بە بەهەشت وەك زیادە چاكەیەك و ڕێزلێنانێك، خودای گەورە دەفەرمووێت:

﴿ .... عَذَابِىٓ أُصِيبُ بِهِۦ مَنْ أَشَآءُ ۖ وَرَحْمَتِى وَسِعَتْ كُلَّ شَىْءٍ ۚ فَسَأَكْتُبُهَا لِلَّذِينَ يَتَّقُونَ وَيُؤْتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَٱلَّذِينَ هُم بِـَٔايَٰتِنَا يُؤْمِنُونَ ﴾ الاعراف(١٥٦).

واتە:(سزا و تۆڵەم تووشی كەسێك دەكەم كە بمەوێت و ( شایستە بێت)، ڕەحمەت و میهرەبانیم هەموو شتێكی گرتۆتەوە، جا لەمەودا ئەو ڕەحمەت و میهرەبانیم تۆماردەكەم و بڕیار دەدەم بۆ ئەو كەسانەی كە تەقوا و پارێزكاری

دەکەن و زەکات دەدەن و ئەوانەش کە باوەڕی تەواو بە ئایەت و فەرمانەکانی ئێمە دەهێنن)، کەواتە بەزەیی ئەو هێندە زۆرە، ئازار و سزاکانی خوداش دەگرێتەوە.

با پرسیارێك لە کاکی دکتۆر بکەم، ئایا بە ڕای ئێوە خودای گەورە زیاتر دادوەر دەبوو ئەگەر تاکێکی ستەمکار لەگەڵ یەکێکی تری ناستەمکار یەکسان کردبایە ؟! یان بکوژ و کوژراو وەك یەك لە ڕۆژی دوایی پاداشتیان بداتەوە؟.
یان بە ڕای دکتور ئایا خودای گەورە دادپەروەر دەبوو کاتێك ڕەش و سپی وەکو یەك لێکرابان؟

بۆ ئەو کەسانەی دەڵێن خودا بەندەکان سزا و ئازار نادات دەڵێم: ئایا خودای گەورە لەم ژیانی دونیایە بە ڕاستی ئازاریان نادات؟! باشە ئێوە چی دەڵێن بۆ پیربوون، نەخۆش کەوتن، شێرپەنجە، ئایا ئەمە ئازاردان نییە؟ یان ئەو میکروبەی دەبێتە مایەی نەخۆشیەکان خودا دروستی نەکردووە ؟ ئایا ئەمانە هەموویان ئاگادارکردنەوە نین بۆ ئەوەی بزانین کە ئێمە لە ژێر دەستی خودایەکین دەکرێت سزا و ئازارمان بدات؟

# بـــــــەشی شەشەم

## بـــۆچوونـی ئیسلام بەرامبەر ئافرەت
## یـان چیرۆکـی ئیسلام لەگـــەڵ ئافرەت

دکتۆری هاوڕێم گوتی: ئایا تۆ لەگەڵم هاوڕای لەسەر ئەو بۆچوونەی کە دەڵێت هەڵسەنگاندن و بۆچوونی ئیسلام لەبارەی ئافرەتـەوە کۆنەپەرستییە؟! پاشان بەهۆی پەنجەکانییەوە دەستی بە ژماردن کرد و گوتی: چیرۆکی فرەژنـی و، مانـەوەی ئـافرەت لـە ماڵـەوە و باڵاپۆشـی، هـەروەها دەسـت هـەڵگرتن (طلاق) بەدەستی پیاوە. هەروەها لێدانی ئافرەت و لێدوورکەوتنەوە لـە کـاتی خـەوتن، ڕێپێـدان بـۆ هـەبوونی ژمارەیـەك ئـافرەتی خزمـەتکار، هـەروەها چـیرۆکی پیاوەکان زاڵن بەسەر ئافرەتەکاندا و، بەشی دوو ئەوەندەی بەشی ئافرەتـە لـە میراتبردنی سامان؟!

منیش وەڵامم داوە و گوتم: ئەم جارە تۆمەتـەکان زۆرن و گـەورەن، قـسەکردن لەسەر زۆر درێژ دەبێتـەوە، بـەڵام بـا لـە پـێش ئیسلامەوە دەست پـێ بکـەین، کاتێك کە ئیسلام هات نەزانین بەسەر خەڵکدا زاڵ بـوو، خۆشت ئـەم ڕاستییە دەزانی، لەو کاتـە کـچ کاتێـك لـە دایك دەبـوو دەیـان کوشت یـان زیندەبەچاڵ دەکرا. پیاو (دە) ژن یان (بیست) یان زیـاتری دەهێنـا، خزمـەتکاری ئـافرەتیش زۆری لێدەکرا بۆ ئەوەی کاری سێکسی ئەنجامبدات و لە بەرامبەردا، خاوەنیـان پارەیان وەردەگرت...... بەڵام کاتێك کە ئیسلام هات فرەژنی سنووردار کـرد بـۆ چوار ژن، ئەمەش ڕزگارکردنی ژن بوو لە شـەرمەزاری و کوشـتن و کوێڵایـەتی و بـێ بـەهایی...... ئـەوەی ئێـستا لـە ئـەوروپا هەیـە دەبیـنین کاتێـك پیاوێـك سەرەڕای ژنی خۆی چەند خۆشەویستی تـری هەیـە، بـە نهێنـی پەیوەنـدی لـە نێوانیانـدا دروسـت دەبێـت و بەدڕەوشـتی پەیـدا دەبێـت، ئایـا ئەمـە باشـتر و خۆشـترە بـۆ ئـافرەت، یـان ببێتـە ژنـی دووەم یـان سـێیەم بـە ویـستی خـۆی و هەموو مافێکی ژنایەتی بـە دەسـت بهێنێـت و ڕێـزی لێ بگیرێـت؟!...یـان ببێتـە خۆشەویستی نهێنی لە پەناکان پەیوەندی دروست بکات و سـۆراغی تێربـوونی ئارەزووەکانی بکات ؟!

لەگـەڵ ئەوەشـدا ئیـسلام کاتێـك فرەژنـی فەراهـەم دەکـات و ڕێـی پێـدەدات. بەشێوەیەکە دەتـوانین بڵێین مـەحاڵ و ئەستەمە، چونکە بـۆ ئـەم فرەژنییـە مـەرجێکی دانـاوە، کـە هـەموو کـەس ناتوانێـت جێبـەجێ بکـات، کـە ئـەویش دادپەروەرییە لە نێوان ژنەکاندا، خودای گەورە دەفەرموێت:﴿ ...فَإِنۡ خِفۡتُمۡ أَلَّا تَعۡدِلُواْ فَوَٰحِدَةً ... ﴾ النساء (٣). واتە: (...خـۆ ئەگـەر ترسـان لـەوەی کـە نـەتوانن

دادپەروەر بن، ئەوە با یەك ژن مارە بكەن). لە شوێنێكی تر دەفەرمووێت:﴿ وَلَن تَسْتَطِيعُوٓاْ أَن تَعْدِلُواْ بَيْنَ ٱلنِّسَآءِ وَلَوْ حَرَصْتُمْ .... ﴾ النساء(١٢٩).

واتە:(هەرگیز ئێوە ناتوانن لە نێوان هاوسەرەكانتاندا دادپەروەرانە رەفتاربكەن، لە كاتێكدا ئەگەر زۆریش سوور بن لەسەری). كەواتە ئەگەر ئێمە توانای چەسپاندنی دادپەروەریمان نەبێت لە نێوان ژناندا، هەتا كەسێك كە سووریش بێت لەسەر چەسپاندنی، ئەو كاتە تەنها هەندێك كەسانی كەم دەتوانن ئەم كارە ئەنجامبدەن، كە ئەوانیش پێغەمبەران و پیاوچاكانن....

لەبارەی دەرنەچوونی ئافرەت لە ماڵەوە، ئەمە شتێكە تایبەتە بە خێزانەكانی پێغەمبەرەوە(دروودی خوای لە سەر بێت) كە لە قورئان هاتووە:﴿ وَقَرْنَ فِي بُيُوتِكُنَّ .... ﴾ الاحزاب(٣٣). واتە: (ئەی خێزانەكانی پێغەمبەر لە ماڵی خۆتان بمێننەوە...). دەتوانین بڵێین ئەمەش ئاماژەیەكە بۆ ئەوەی كەوا بۆ ئافرەت باشترە لە ماڵەوە بمێنێتەوە و منداڵ بەخێوكردن و بەڕێوەبردنی ئیش و كاری ماڵەوە بۆی باشترە. ئەگەر ئێمە بیر لە حاڵی گەلێك بكەینەوە كاتێك ئافرەتەكانیان لە كۆلانەكان و نووسینگەكان كات بەسەر ببەن، لە بەرامبەردا منداڵەكانیان لە داینگە و شوێنەكانی حەوانەوە بن. باشە حاڵی ئەم گەلە باشترە یان گەلێك ئافرەتەكانیان لە ماڵەوە بن و ماڵ و منداڵەكانیان بەخێو بكەن و پەروەردە بكەن ، منداڵ لە باوەشی دایكیدا پەروەردە ببێت؟..... لێرەشدا شتەكە روونە پێویست بە وەڵامدانەوە ناكات.....!

بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، ئیسلام هیچ كاتێك رێگری لە ئافرەت ناكات لە چوونە دەرەوە و كاركردن لە كاتی پێویستیدا، باشترین بەڵگەش بۆ ئەمە، ئەگەر

تەماشای مێژووی ئیسلام بکەین دەبینین زۆر ئافرەت هەبوون بەشداریان لە جەنگدا کردووە، شاعیر و زانا و زانستخواز بووینە، لە پێناو فێربوون گەشتیان ئەنجامداوە.. ... کەواتە ئایەتەکە بانگەواز بووە بۆ خێزانەکانی پێغەمبەر (دروودی خوای لە سەر بێت)، وەك نموونەیی و پایە بەرزی، لەگەڵ ئەوەشدا خێزانەکانی پێغەمبەر لەگەڵیدا دەردەچوون بۆ غەزا و شەڕ. کەواتە دەتوانین بڵێین دەرچوونی ئافرەت بۆ یارمەتیدانی پیاوەکەی، یان ئەنجامدانی کارێکی چاك هیچ گومانی تێدا نییە کەوا ڕێگە پێدراوە لە ئیسلامدا.

لەبارەی سەرپۆشی یان باڵاپوشی ئافرەت، دەتوانین بڵێین ئەمە لە بەرژەوەندی ئافرەتدایە، ئیسلام ڕێگەی بە ئافرەت داوە دەم و چاو و دەستی بەدیار بخات، بێجگە لەمانە ڕێگە پێنەدراوە. هەروەها ئاشکرایە هەموو شتێکی ڕێگەپێنەدراو حەز لێکراوە، داپۆشینی شوێنە سەرنجڕاکێشەکان زیاتر سەرنجی مرۆڤ ڕادەکێشێت.

هەروەکو ئاشکرایە لە نێوان هەندێك هۆزی دواکەوتوو کە ژن و پیاویان بەتەواوی ڕووتن، حەز و ئارەزووی لێك نزیك بوونەوەیان زۆر لاوازە، تەنانەت لە مانگێ جارێك کاری لێك نزیك بوونەوە ئەنجام نادەن. ئەگەر ئافرەتیش بوو بە دووگیان لەوانەیە لە دوو ساڵ زیاتریش لێك نزیك نەبنەوە. هەروەها لە کەنار دەریاکان کاتێك ڕووتی دەبێتە شتێکی بینراو، لەو کاتە لاشەی ڕووتی ئافرەت سەرنجڕاکێشی و جوانی و شاراوەکانی لە دەستدەدات و دەبێتە کارێکی سروشتی توانای بەرزکردنەوەی هەست و ووروەی مرۆڤەکانی نامێنێت.

ئەمەش گومانی تێدا نییە کاتێك ڕێگری دەگرێت ئافرەت ببێتە لاشەیەکی مردوو هیچ تام و چێژی نەمێنێ لە بەرژەوەندی ئافرەتدایە......

سەبارەت بە دەست لەسەر هەلگرتن یان بەردانی ئافرەت، ڕاستە بە دەست پیاوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ماف بە ئافرەت دراوە لە دادگا داوای تەلاق یان بەردان بکەت و دەتوانێت بەدەست بهێنێت ئەگەر بەڵگەی تەواوی بەدەستەوە بوو...... هەروەها بۆ ئافرەت هەیە لەکاتی مارەبڕیندا بۆ پاراستنی مافەکانی خۆی هەندێك مەرج دابنێت، کەواتە وەکو پیاو مافی هەیە لە کاتی تەلاقداندا.

ئیسلام هەندێك مافی بە ئافرەت داوە کە لە ئەوروپا ئافرەت ناتوانێت ئەم مافانە بەدەست بهێنێت...... لە ئیسلامدا ئافرەت مافی مارەیی وەرگرتنی هەیە، لە ئەوروپا ئافرەت پارە (دوطـة) دەدات..... ئافرەت لە ئیسلام مافی ئەوەی هەیە پارە و سامانی تایبەت بە خۆی هەبێت و سەربەست بێت لە بەکارهێنانی ئەم پارە و سامانە. بەڵام لە ئەوروپا ئەم مافەی نییە کاتێك کە مێرد دەکات.

لەبارەی لێدان و دوورکەوتنەوە لە ئافرەت، ئەمە هەڵسوکەوتێکە تەنها لەگەڵ ئەو ئافرەتە بەکاردێت کە هەردەم تووڕەیە و ڕاناوەستێت و مافەکانی پیاو بە دروستی نادات. بەڵام ئافرەتی بە ڕەوشت و ڕێکوپێك مافی بەسەر پیاوەوە هەیە کە لێی نەدات، بەڵکو دەبێت ڕێزی لێبگرێت و بە دادپەروەرانە هەڵسوکەوتی لەگەڵدا بکات.

بەکارهێنانی لێدان و دوورکەوتنەوە لەگەڵ ئافرەتی تووڕەبوو لە مێردەکەی، دەتوانین بڵێین موعجیزەیەکی قورئانی پیرۆزە لەبارەی تووڕەبوونی ئافرەت....... چونکە زانستی دەروونی ئەم سەردەمە ئەم ڕاستییەی سەلماندووە

کــە حاڵــەتێکی نەخۆشــییە بــۆ ئــافرەت. زانــستی دەروونزانــی ئــەم جــۆرە نەخۆشییە دەکات بە دوو بەشەوە:

**بەشی یەکەم** پێی دەڵێن حاڵەتی ملکەچبوون (خضوع )(masochism) ، کە ئەمــەش حاڵــەتێکی نەخۆشییە ئــافرەت چــێژ وەردەگرێــت کاتێــك کــە لێدان لەگەڵی بەکاردێت و ببێتە لایەنی ملکەچبوو.

**بەشــی دووەم:** پێــی دەڵــێن حاڵــەتی حــەزی زاڵبــوون (التحكمــي) کــە زاراوە زانــستیەکەی (sadism)ە، کــە ئــەویش حاڵــەتێکی نەخۆشــییە ئــافرەت چــێژ وەردەگرێت کاتێك زاڵبێت یان هەموو شتێك بە دەستی ئەو بێت و دەسەڵاتی بەدەســت بێــت و بــەکاربهێنێت و زۆری بــەکاردەهێنێت و ئــازار بــە بەرامبــەر دەگەیەنێت. ئەگەر ئافرەتێك سیفەتی بەم شێوەیە بێت، کەواتە باشترین رێگا بۆ شکاندنی ئەم دەسەڵات و توندییە، بەکارهێنانی هــەمان چــەکە کــە ئــافرەت هەیــەتی، ئــەویش چــەکی مێینەیــە، کەواتــە نەخــەوتن لــەلای ئــافرەت یــان دوورکەوتنەوە لێی ئەم جۆرە چەکە لاواز دەکات و ناتوانێت زاڵبێت بەسـەر ئەوانی تر........

ئەو ئافرەتەی کە چێژ لە لێدان وەردەگرێت لێدان بۆ ئەو چارەسەرە...... لێرە چارەســەری قورئــان بــەدیار کــەوت کاتێــك کــە دەڵێــت:﴿ ......وَٱهۡجُرُوهُنَّ فِي ٱلۡمَضَاجِعِ وَٱضۡرِبُوهُنَّۖ فَإِنۡ أَطَعۡنَكُمۡ فَلَا تَبۡغُواْ عَلَيۡهِنَّ سَبِيلًاۗ ﴾ النــــــساء(٣٤).

واتە: ( لەناو جێدا پشتیان تێبکــەن، ( ئەگــەر ئــەوەش سوودی نــەبوو) لێیـان بدەن ( بە مەرجێك لە دەم و چاو نــەبێت و ئاسەوار بــە جێنــەهێڵێت) ئەگـەر بەم هۆیانە لە لادان و یاخی بوون وازیان هێنا، ئەوە ئیتر ستەمیان لێمەکەن و

ڕێگەی تر مەگرنەبەر). وەکو ئیعجازێکی زانستی کە زانستی دەروونزانی بە چەند قۆناغ و کتێبێکدا سەلماندووە، قورئانی پیرۆز بە دوو وشە ئەم ڕاستییە بۆمان دەسەلێنێت. سەبارەت بە چیرۆکی کویلایەتی، کەوا هاوڕێیەکەم پرسیاری لێ کردووم، گوایە ئیسلام داوای کویلایەتی دەکات هەروەکو ڕۆژهەلاتناسەکان ئیسلامی پێ تومەتبار دەکەن، ئەمەش تۆمەتێکی زۆر دوورە لە ڕاستییەوە، چونکە ئیسلام تاکە ئایینە کەوا داوای ڕزگاربوون دەکات لە دەردی کویلایەتی. ئەگەر دەقەکانی ( قورئان)ئیسلام بەراود بکەین بە دەقەکانی ئینجیل، یاخود قسەکانی (بۆلس) کە لە نامەکەی بۆ خەلکی (ئەفسس) دەنێرێت پێیان دەلێت دەبێت کویلە و بەندەکان گوێڕایەل بن بۆ سەروەرەکانیان. پێیان دەلێت ( ئەی کویلەکان..... گوێڕایەل بن بۆ سەروەرەکانتان، بە ترس و لەرزەوە وە بە دلێکی سادەوە خزمەتیان بکەن ).

هیچ کاتێك ئینجیل داوا ناکات کە هەولبدرێت کویلایەتی لابەرێت. تەنها ئەوەی کە باس دەکات، ئەوەیە کە دەبێت خۆشەویستی بۆیان بنوێنن و هەلسوکەوتی باش لەگەلیان ئەنجامبدەن.

هەروەها لە تەوراتیش نەك ئەوانەی بەندە و کویلەن، بەلکو هەموو کەسێك دەکرا بە کویلە کاتێك ئەگەر شەڕ لە نێوان ئەوان و جولەکەکاندا روودەدا (تەورات) پێمان رادەگەیەنێت ئەگەر هاتوو خەلکی شارێك شەڕیان نەکرد، بەلکو خۆیان بەدەستەوەدا، ئەو کاتە هەموو دەکرێن بە کویلە. هەروەها ئەو شارەی شەڕ دەکات و بەرگری لە خۆی دەکات ، دەبێت هەموویان بکوژرێن، پیر و گەنج و ژن و مندال......

کەواتە کاتێك کە ئیسلام هات کویلایەتی بارێکی کۆمەلایەتی جێگیر بوو. هەموو ئایینەکانی پێش ئیسلام ئامۆژگاری کویلەکانیان دەکرد کە خزمەتکاری سەروەرەکانیان بن. قورئانی پیرۆز یەکەم پەرتووکی ئاسمانی بوو کە باس لە رزگارکردنی کۆیلە و بەندەکان و هانی خەلك دەدات کە کۆیلەکان رزگار بکەن لە پێناو ڕەزامەندی خودا و پاداشتی دواڕۆژ.

قورئانی پیرۆز بە دەقێکی روون کۆیلایەتی حەرام ناکات و داوا ناکات بە یەکجاری کۆیلەکان ڕزگار بکەن چونکە ئەگەر بە یەکجاری کویلەکان ڕزگار بکرێن بە فەرمانی قورئان، لەوکاتە سەدەها هەزار کەس بە بێ کار و شوێنی حەوانەوە کارەساتێکی کۆمەلایەتی دروست دەبوو، زۆربەیان لەسەر رێگا و شەقامەکان دەکەوتن و دەستیان بۆ خەلك پان دەکرد و داوای یارمەتیان دەکرد. هەموو کارێکی نابەجێشیان ئەنجام دەدا، بۆ ئەوەی بژێوی ژیانیان دابین بکەن. لەو کاتە شتێکی تر رووی دەدا زۆر خراپتر لە کۆیلایەتی.......

کەواتە چارەسەری قورئان زۆر ژیرانە بوو. ئەویش بە داخستنی دەرگای بەکویلەکردن و هاندانی خەلك بۆ رزگارکردنیان. سەرچاوەی سەرەکی کویلایەتی لەو سەردەمە گیراوەکانی جەنگ بوون، قورئانیش فەرمانی دا کە گیراوەکان رزگار بکرێن بەرامبەر بە هەندێك پارە، یانیش بێ بەرامبەر. خودای گەورە دەفەرموویت:﴿ ....فَإِمَّا مَنًّا بَعْدُ وَإِمَّا فِدَآءً حَتَّىٰ تَضَعَ ٱلْحَرْبُ أَوْزَارَهَا ۚ .. ﴾ محمد(٤).واتە: (...یەکێك لەم دوو کارانە لەگەڵ دیلەکان بکە: یان بە پیاوەتی و منەت ؛ یاخود بە گۆڕینەوە و فیدییە ئازادیان بکەن، تا شەڕ کۆتایی دێت). ئەو کۆیلانەش کە هەبوون دەبوایە هەنگاو بە هەنگاو ڕزگار بکرێن، وەکو ڕزگارکردنی بەرامبەر لێخۆشبوونی هەندێك تاوان....... تا ئەو کاتەی

کۆیلایەتی تەواو دەبێت و نامێنێت. کابرای سەروەر دەبوایە وەکو خێزانی هەڵسوکەوت لەگەل کۆیلەی ئافرەتەکان بکات، دیاریشە هەڵسوکەوت لەگەڵ کردن وەکو خێزانی خۆی، لەوکاتە، وەك ڕێزلێنان بوو، نەك کەمکردنەوە بوو، بۆ نرخ و پایەیەی ئەو........ دەبێت ئەوەش لە بیر نەکەین کە ئیسلام چۆن بڕواداران دەکاتە برای یەکتر، قورئان دەفەرمووێت:﴿ إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ ..... ﴾ الحجرات(١٠). واتە: (بڕواداران برای یەکترن، ...). هەروەها دەفەرمووێت:﴿ هُوَ ٱلَّذِى خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَٰحِدَةٍ ..... ﴾ الاعراف(١٨٩). واتە: ( خوا ئەو زاتەیە کە ئێوەی لە یەك نەفس و لە یەك شت دروست کردووە). وە دەفەرمووێت:﴿ ....وَلَا يَتَّخِذَ بَعْضُنَا بَعْضًا أَرْبَابًا مِّن دُونِ ٱللَّهِ .... ﴾ آل عمران:(٦٤). واتە: ( هیچ لایەکمان لاکەی ترمان ( بە پیرۆز و فەرمانڕەوا دانەنێین) لە جیاتی ئەو زاتە و نەیپەرستین).

پێغەمبەریشمان باشترین نموونەی بۆ ئێمە پێشکەش کرد کاتێك کە ( زیدی کوڕی ثابت ) کرد بە کوڕی خۆی، کە کۆیلەیەك بوو لە کۆیلەکان، پاشان ژنێکی لە بنەماڵەی خۆی لێ مارە کرد. کە ئەویش ( زینبی کچی جەحش ) بوو.

ئەوە هەموو لە پێناو ئەوەبوو کە گۆڕانکاری بکات لە ژیانی کۆمەلایەتی، ئەو توندی و دەمارگیریەی هەیە نەهێلێت. رزگارکردنی کۆیلەکان بکاتە بەرنامەیەك خەڵکانی تر وەکو ئەو بکەن. بەکردەوە بسەلمێنێت کە ئیسلام خەڵك لە کۆیلایەتی رزگار دەکات.

سەبارەت بە پرسیارەکەت کە دەڵێی ئیسلام دەڵێت پیاوەکان باڵادەستن بەسەر ئافرەتانەوە، من دەڵێم ئەمە ڕاستییەکە لە هەموو شوێنێك هەر وایە، لە وڵاتە ئیسلامییەکان، لە وڵاتە مەسیحییەکان، هەروەها لەو وڵاتانەش کە هیچ خودا و ئایینێکیان نییە.

لە ( مۆسکۆ ) لە کۆنەوە، لە سەردەمی ( لینین و ستالین و خروشۆڤ ) تا ئەمڕۆ. لە فەرەنسا هەر پیاوە دەسەڵاتی بەدەستەوەیە، هەروەها لە لەندەن........ لە هەموو شوێنێك لەم دونیایە هەر پیاون سەرکردە و یاسادانەر و داهێنەر، هەموو پێغەمبەرانیش هەر پیاو بوون، فەیلەسوفەکان پیاو بوون، هەتا ئاواز دانەریش پیاون، هەر چەندە ئاواز دانان کارێکی خەیاڵییە پێویستی بە پیاو نییە. هەروەکو ( عباس محمود عەققاد ) بە گاڵتەوە دەڵێت: هەتا پیشەی خواردن لێنان و دروومان و جل و بەرگ دروستکردن کە پیشەی تایبەتن بە ئافرەت، پیاوەکان تێدا سەرکەوتوو ترن...... کە ئەمەش هەندێك دیاردەن هیچ پەیوەندی بە شەریعەتی ئیسلامەوە نییە........ بەڵکو دیاردەی گشتین لە هەموو شوێنەکانی دونیا هەن، پەیوەندی بە ئیسلام و قورئانەوە نییە. ئەمانە چەند ڕاستیەکن دووپاتی ئەوە دەکەن کە لە ڕاستیدا پیاو باڵا دەستە لەسەر ئافرەت بەهۆی سروشت و توانای جەستەیی و سەروەری پیاو کە چەند سیفەتێکی خودا بەخشن.

ئەگەر لە شوێنێك ئافرەتێك بوو بە گەورەی نەتەوەیەك یان سەرۆکێك ئەمە شتێکی جیاکەرەوەیە و سەراوژێری یاساکەیە کە قورئان ئاماژەی بۆ کردووە........ئیسلامیش تەنها ئەو یاسایەی بۆمان تۆمار کردووە، پاشان

قورئان بۆمان روون دەكاتەوە كە بۆچی پشكی پیاو دوو ئەوەندەی ئافرەتـە لـە میراتگری، چونكە پیاوە خێزان بەرێوە دەبات و بەخێوكردنی لە ئەستۆی ئـەو دایە ، هەر ئەویـشە ئـیش دەكـات ........ كەواتـە رای ئیـسلام لـەبارەی ئـافرەت زۆر دادپەروەرانەیـە. ژیاننامــەی پێغەمبــەریش لەگــەڵ خێزانــەكانی هــەر هەمووی رێزلێنان و خۆشەویستی و بەزەیی بووە، كـە دەفـەرمووێت: (( حُبِّب إليّ من دنيـاكم ثـلاث النـساء والطيـب وجُعلت قـرة عـيني في الـصلاة )) واتـە: (خودای گەورە لە دونیای ئێوە سێ شتی بۆ من رازاندووەتەوە ، ئافرەت ، بۆنی خـۆش هـەروەها شـتی هـەرە خـۆش و ئـارامیم لـە نوێژكردنـدایـە )....... لێـرە پێغەمبەر (دروودی خوای لە سەر بێـت) خۆشەویـستی ئـافرەت دەخاتـە رێـزی بۆنی خـۆش و نوێـژكردن ، كـە ئەمـەش جێگـای شـانازییە....... هـەروەها لـە كۆتایی ژیانی یـەك شـتی زۆر دووپـات دەكـردەوە و هـەر دەی گـوت: (ئاگـاداری ئافرەتەكان بن). وە كاتێك خودای گەورە ئیشی ماڵەوە بـە ئـافرەت دەسـپێرێت و پیاویش دەكاتە پیاوی كۆڵان و ئیش كردن لـە دەرەوەی مـاڵ ، لـەپێناو ئـەوە بووە چونكە ئـەركی ئـاوەدانی و كـاركردن خراوتـە ئەسـتۆی پیـاو ، لـە هـەمان كاتدا ئەركی هەرە گەورە خراوتە ئەستۆی ئافرەت كـە ئـەویش بـەخێوكردن و پـەروەردە كردنـی خـودی مرۆڤـە........ كاتێـك ئیـسلام ئـەم ئەركـە گـەورە و پیرۆزە بە ئافرەت دەسپێرێت ، ئایا ستەم لە ئافرەت دەكات ؟!

# بــــــــەشی حەوتەم

## - ئایا ئاییــن بێهۆشکـــەری مرۆڤە ؟!

دکتۆری هاوڕێم چاوی خۆی جوڵاند و بە منی گوت: ئایا ڕات چوونە دەربارەی ئەو کەسانەی دەڵێن ئایین بێهوشکەرە ؟ هەژار و ستەم لێکراوان بێهوش دەکات بۆ ئەوەی سەرەڕای هـەژاری و ستـەملێکراوی بخـەون و خـەون بـە بەهەشت و ئافرەتی چاو گەورەوە ببینن. لەگەڵ ئەوەشدا زەنگینەکان هەر لە زەنگینبوون بـەردەوام بـن بـەو پاسـاوەی کـە ئەمـە مافێکـە پێیـان دراوە ، خـودای گـەورە خەڵکی بە پلە پلە دروست کردووە.........؟ هەروەها ڕات چۆنە سـەبارەت بـەو کەسانەی کە دەڵێن ئایین نێردراوی خودا نییە ، بەڵکو دروستکراوە لەسەر ئەم زەوییـە، بـەهۆی هەنـدێك هۆکـاری کۆمەلایـەتی ، بـۆ ئـەوەی ببێتـە چـەکێك بەدەسـت چـینێك بەسـەر چـینێکی تـرەوە؟ مەبەسـتیش لـەم قـسانە زانـا مادديەکان و بیرو باوەریانە.

من گوتم:

هیچ شتێك لەو هەڵەیە گەورەتر نییە كە دەڵێین ئایین بێهۆشكەرە...... چونكە لە ڕاستیدا ئایین هەمووی ئەرك و بەرپرسیاریەتییە و شت بەدوادا هاتنە ...... ئایین ئەوە نییە كە بارت سووك بكات و لە هەندێك بەرپرسیارێتی رزگارت بكات، كەواتە ئایین دووركەوتنەوە و هەڵاتن نییە لە ئەرك و بەرپرسیارێتی ، بێهۆشكەریش نییە ، بەڵكو ئایینمان كاركردنە نەك تەمبەڵییە....... خودا دەفەرمووێت:﴿ وَقُلِ اعْمَلُوا فَسَيَرَى اللَّهُ عَمَلَكُمْ وَرَسُولُهُ وَالْمُؤْمِنُونَ .... ﴾ التوبە(١٠٥).واتە: ( بەو خەڵكە بڵێ: ئێوە هەرچی دەتوانن لە كار و كردەوە ئەنجامی بدەن، چونكە خوای گەورە دەبینێت هەروەها پێغەمبەروكەیی و ئیماندارانیش) .... ئێمە باوەڕمان بە پشتبەستن ( توكل ) و پەنابردن بە خودا هەیە، نەك دانیشتن و بڵێین خودا هەموو شتێكمان بۆ دەكات ، چونكە خودا دەفەرمووێت:﴿ ....فَإِذَا عَزَمْتَ فَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُتَوَكِّلِينَ ﴾ آل عمران(١٥٩). واتە: (... ئەگەر بڕیارتدا ( كارێك بكەیت) پشت بە خوا ببەستە، چونكە بەڕاستی خوا ئەوانەی خۆشدەوێت كە پشتی پێدەبەستن....). كەواتە ئایینمان پێمان دەڵێت، ئەوەی لە توانات دایە بە هەموو هێزی خۆت بەكاری بێنە، پاشان بەجێی بهێڵە بۆ قەدەری خودا........ هەروەها پێغەمبەرمان بەو پیاوە شوانەی راگەیاند كە هاتە لای و گوتی: من حوشترەكەم بەڕەڵا دەكەم خودا دەیپارێزێت ، پێغەمبەر پێ ی گوت: (( أعقلها وتوكل )) واتە: (گرێ ی بدە، پاشان بەتەما و پارێزگاری خودا بەجێبهێڵە).

هەر لەسەر ئەم بنچینەیە، ئایین واتای وشیاری و ئاگا لەخۆبوون و نەخەوتن دەگەیەنێت..... هەروەها ئایین لێپرسینەوەی نەفس و ئاگاداربوونی ویژدانە، لە هەموو کار و کردەوەیەك ، لە هەموو وشە و بیرکردنەوەیەك ، کەواتە ئایین نەوەك حاڵی ئەو کەسەیە کە ماددەی بیهۆشکەر دەخوات .... بەڵکو بخۆری ڕاستەقینەیی ماددەی بێهۆشکەر تەنها مرۆڤی ماددییە ، ئەوەی کە ئایین ڕەت دەکاتەوە لە پێناو خۆ دزینەوە لە داواکارییەکانی ئایین و بەرپرسیارێتیەکەی ...... هەروەها ئەم جۆرە پیاوە پێی وایە کە ئازادە و هیچ کەسێك مافی لێپێچینەوە لەگەڵ ئەودا نییە ، خۆی بەرپرسە لە خۆی و هیچ مردن و زیندووبوونەوەیەك لە ئارادا نییە....... هەموو شتێك بە هەوەسی خۆی دەکات ... باشە تۆ بڵێی ئەم پیاوە وەکو پیاوێکی خاوەن ئایین و باوەڕ بێت کە خۆی بە بەرپرسیار دەزانێت بەرامبەر هەموو شتێك کە پەیوەندی بە ئەوەوە هەبێت..... کاتێك تاکە کەسێك برسی دەبێت یان لە ئاژەڵێك بدات، خۆی بەرپرسیار دەزانێت، چونکە بە ئەرکی خۆی هەڵئەستاوە بەرامبەریان، وەکو ئەرکێکی ئایینی کە لە ئەستۆی ئەو دایە.

هەروەها ناڕاستیشە کاتێك کە دەڵێن ئایینەکەتان دروستکراوی ئەم زەوییە بەهۆی هۆکاری کۆمەڵایەتییەوە..... بۆ ئەوەی ببێتە چەکێك بە دەست هەندێکەوە دژی هەندێکی تر و دەوڵەمەندی و هەژاریش ببێتە شتێکی جێگیر و نەگۆڕاو.........

کاتێك کە ئیسلام هات . شۆڕشێك بوو دژی دەوڵەمەندەکان و ئەوانەی سەروەت و سامان کۆدەکەنەوە و چەوسێنەر و ستەمکارن..... زۆر بە ڕاشکاوی و ڕوونی قورئان داوا دەکات کە پارە و سامان نەکەوێتە دەست دەوڵەمەندەکان

و له نێوان خۆیان جۆڵه و کڕین و فروشتنی پێ بکەن. بەڵکو دەبێت مافێك بێت بۆ هەموویان. خودای گەورە دەفەرمووێت:﴿ ...ۗ وَٱلَّذِينَ يَكْنِزُونَ ٱلذَّهَبَ وَٱلْفِضَّةَ وَلَا يُنفِقُونَهَا فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ فَبَشِّرْهُم بِعَذَابٍ ﴾ التوبـــه(٣٤). واته: (... جا ئەوانەی کە ئاڵتون و زیو کۆ دەکەنەوە و قایمی دەکەن و لە پێناو ڕێبازی خوادا و بۆ ڕەزامەندی ئەو، نایبەخشن ئەوە مژدەی سزایەکی پڕ ئێشیان بدەرێ).

بەخشینیشی زەکات بەرێژەی (٢،٥ ٪) دەستپێدەکات، لەمە زیاتر دەتوانێت ببەخشێت، بەڵام نەك بە زۆری، بەڵکو بە ویستی خۆی ، تا دەگاتە هەموو ئەو پارەیەی کە هەیەتی . یان بەجێهێشتنی تەنها بەشی خۆی ... خودا دەفـــــەرمووێت:﴿ ....وَيَسْـَٔلُونَكَ مَاذَا يُنفِقُونَ قُلِ ٱلْعَفْوَ ۗ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمُ ٱلْـَٔايَـٰتِ لَعَلَّكُمْ تَتَفَكَّرُونَ ﴾ البقره(٢١٩). واته: ( پرسیارت لێ دەکەن کە چی بەخشن؟ پێیان بڵێ: هەر چیتان لێ زیادە دەتوانن بیبەخشن، ئا بەو شێوەیە خوای گەورە ئەم بەڵگەو فەرمانانەتان بۆ ڕوون و ئاشکرا دەکات بۆ ئەوەی بیر بکەنەوە).

کەواتە بەم شێوەیە ئیسلام دوو شت پێکەوە کۆ دەکاتەوە ، داواکراوی بە زۆری یاسایی، لەگەڵ داواکراوی خۆویستانە، گرێدراو بە ویژدانەوە...... کە ئەمە زۆر باشتر و ڕێزلێنراوترە بۆ مرۆڤەکان لەوەی کە ئەوەی هەیەتی لێ وەربگرن و بە زۆری دەست بەسەری بکەن....... دەتوانی لە (٩٠٪) ببەخشی بە بێ ئەوەی کاریگەری لێ بکات.

ئا لێرەوە دەتوانین بڵێین ئیسلام نەهاتووە تاکو بەردەوامی بە ستەمکاری ستەمکاران بدات.... بەڵکو شۆڕشێکە لەسەر هەموو ستەمکاران ، شەڕ و شمشێرێکە لە سەر ئەستۆی هەموو چەوسێنەران و تاوانباران و زۆرداران.

لەبارەی ئەو تومەتەی خاوەن بیرە ماددیەکان دەخەنە ڕوو دژ بە ئیسلام، گوایە ئیسلام ئایینێکی دواکەوتووە و بڕوای بە چینایەتی هەیە، بە هێنانی چەند ئایەتێك لەسەر ئەم تومەتە وەکو:﴿ وَٱللَّهُ فَضَّلَ بَعۡضَكُمۡ عَلَىٰ بَعۡضٖ فِي ﴾ النحل(٧١). واتە:(خوا لە بەخشینی رزق و رۆزیدا بەشی هەندێکتانی زۆرترداوە لە هەندێکی تردا..). هەروەها:﴿ أَهُمۡ يَقۡسِمُونَ رَحۡمَتَ رَبِّكَۚ نَحۡنُ قَسَمۡنَا بَيۡنَهُم مَّعِيشَتَهُمۡ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَاۚ وَرَفَعۡنَا بَعۡضَهُمۡ فَوۡقَ بَعۡضٖ دَرَجَٰتٖ لِّيَتَّخِذَ بَعۡضُهُم بَعۡضٗا سُخۡرِيّٗاۗ وَرَحۡمَتُ رَبِّكَ خَيۡرٞ مِّمَّا يَجۡمَعُونَ ﴾ الزخرف(٣٢). واتە:( ئایا ئەوانە ڕەحمەتی پەروەردگاری تۆ دابەش دەکەن؟ لە کاتێکدا ئێمەین کە رزق و ڕۆزیمان لە نێوانیاندا دابەش کردووە لە ژیانی دنیادا و پلە و پایەی هەندێکمان بەرزکردۆتەوە بەسەر هەندێکیاندا، بۆ ئەوەی هەمووان کاروباری یەکتر تەواوبکەن و کەڵك لە توانایی و لێهاتوویی یەکتر وەربگرن، جا لەگەڵ ئەو هەموو بەهرە و بەخششانەدا ڕەحمەت و میهرەبانی پەروەردگاری تۆ لە هەموو ئەو شتانەی کە خەڵکی کۆی دەکەنەوە چاکتر و بە نرختره).

ئێمە وەڵام دەدەینەوە و دەڵێین: ئەم ئایەتانە بەڵگەن لەسەر ئەوەی دەبینین کە لە ( مۆسکو ، لەندەن ، پاریس و بەرلین ) هەیە. هەر هەمان شت لە ( قاهیرە ، دیمەشق و جەددە ) دەبینین.

له هەموو شتێك و لایەنێك بە یەك دەچن، کەواتە باشتربوونی بواری ئابووری هەندێك کەس لە هەندێکی تر و جیاوازی لە نێوان چینەکانی کۆمەلگا ڕاستیەکی بنەڕەتییە ، کۆمۆنیستێك نەیتوانیوە ئەم جیاوازیە بگۆڕێت ، هەتا بیری ماددی توندڕەویش بڕوای بە یەکسانی نییە ، چونکە یەکسانی شتێکی ئەستەمە..... کەواتە ئێمە چۆن دەتوانین دوو کەس یان دوو شتی نایەکسان یەکسان بکەین ؟! خەڵك لەو ڕۆژەوە کە لە دایك دەبن لە ڕووی " زیرەکی ، هێز ، جوانی ، بەهرەمەندییەوە بە نایەکسانی لەدایك دەبن و هەریەك پلە و ئاستێکی هەیە. هەروەها دەبینین هەموو ڕێڕەو و لایەنە ئابوورییەکان لە هەوڵی ئەوەدان لە ڕووی پەیداکردنی هەڵ و دەرفەتی کارەوە، یەکسانی بۆ خەڵك بەرجەستە بکەن، نەك یەکسان کردنی خەڵك لە هەموو ڕوویەکەوە..... هەموو کەسێك وەکو یەك دەرفەتی چارەسەر یان فێربوون یان دابین کردنی نزمترین ئاستی بژێویان هەیە..... هەموو ئایینەکانیش هەوڵ بۆ هەمان مەبەست دەدەن.... بەڵام ئەگەر هەوڵ بدات بۆ نەهێشتنی جیاوازی لە پلە و پایە ، ئەوە خۆی لە خۆیدا ستەمە و پێچەوانەی یاساکانی سروشتە. چونکە سروشت لە بنەڕەتدا لە هەموو ڕوویەکەوە جۆراوجۆر و جیاواز و کەم و زۆرە. لە بەروبووم، ئاژەڵ، مرۆڤەکان..... بۆ نموونە پەمۆ هەیە گوڵی درێژە و هەیە گوڵی خڕ و کورتە. لە مرۆڤەکان و زیندەوەران دەبینین هەریەکە ڕەنگێك و سیفەتێك و پلەیەکی دیاریکراوی هەیە. ئەمە یاسای ئەم گەردوون و هەبوونەیە..... ئەگەر هەموو مرۆڤەکان بەیەك شێواز و قالب ئافرێندرابانایە ، لەو کاتە پێویست نەدەبوو هەریەکە لە دایکبوونی تایبەت بە خۆی هەبێت . دەکرا یەك نموونە هەبوایە لە جیاتی هەموویان. لە شتەکانی

تریش بەهەمان شێوە ..... ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت کەوا ئەم سروشتە هەژارە و هیچی بە دەستەوە نەماوە ، بەڵکو ئەمە ئەوەیە کە ئەم سروشتە زۆر بە پیت و زەنگینە و زەنگینی و بە پیتییەکەشی بەدیار ناکەوێت تەنها لە جۆراوجۆری نەبێت لە بەروبووم و دانەوێڵە و هەمەڕەنگی لە جۆر و ڕەنگەکانی....... لەگەڵ ئەوەش ئایین بێدەنگ نەبووە لەسەر هەبوونی جیاوازی لە نێوان دەوڵەمەند و هەژارەکان، بەڵکو داوا دەکات و هەوڵ دەدات ئەم بارە بگۆڕێت ، داوا دەکات کە مرۆڤی هەژار بەشی خۆی هەبێت لە سامانی دەوڵەمەندەکان، هەروەها دەڵێت هەبوونی ئەم جۆرە جیاوازییە تاقیکردنەوەیەکە ، خودای گەورە دەفەرمووێت:﴿ ....وَجَعَلْنَا بَعْضَكُمْ لِبَعْضٍ فِتْنَةً أَتَصْبِرُونَ وَكَانَ رَبُّكَ بَصِيرًا ﴾ الفرقان(٢٠). واتە: (...ئێمە هەندێك لە ئێوەمان کردۆتە هۆی تاقیکردنەوەی هەندێکی ترتان، ئایا خۆدەگرن و خۆڕاگر دەبن، بێگومان پەروەردگاری تۆ هەمیشە و بەردەوام بینایە).

خودای گەورە هێز و توانا دەدات بە هەندێك کەس و تەماشای دەکات ئاخۆ ئەم هێزە بۆچی بەکاردەهێنێت، ئایا بۆ یارمەتی دانی مرۆڤی لاواز و هەژارە، یان بۆ لێدان و کوشتنی خەڵکە؟ هەروەها پیاوی دەوڵەمەندیش بە هەمان شێوە، ئایا دزی دەکات و فێر لە خەڵك دەکات، یان چاکە دەکات و دەستی یارمەتییان بۆ درێژ دەکات؟! تا ببینین پیاوی هەژار چی لە هەژارییەکەی دەکات ..... ئیرەیی بە خەڵك دەبات و دەدزێ و چاوی لە سامانی خەڵکە؟! یان نیش دەکات و خۆی ماندوو دەکات بۆ ئەوەی بە ڕێگایەکی چاك و دادوەرانە ژیانی خۆی باشتر بکات ؟!

ئایین داوا دەکات ئەم ناڵەبارییە لە نێو کۆمەڵگادا نەمێنێت و یەکسانی لە دەرفەت بۆ هەموویان بڕەخسێنێت...... لە بەرامبەریشدا مرۆڤەکان دەترسێنێت بە ئازار و سزایەکی زۆر لە ڕۆژی دواییدا...... هەروەها دەڵێت لە ڕۆژی دوایش ئەم جیاوازی و پلە و پایە زۆر زیاتر دەبێت ئەگەر مرۆڤ نەتوانێت ئەم هاوسەنگییە لە دونیادا دروست بکات، بۆیە دەفەرمووێت:﴿ ٱنظُرۡ كَيۡفَ فَضَّلۡنَا بَعۡضَهُمۡ عَلَىٰ بَعۡضٖۚ وَلَلۡأٓخِرَةُ أَكۡبَرُ دَرَجَٰتٖ وَأَكۡبَرُ تَفۡضِيلٗا ﴾ الإسراء (٢١). واتە(تەماشا بکە و سەرنج بدە چۆن ڕێز و پلە و پایەی هەندێکیانمان داوە بەسەر هەندێکی تریاندا، بێگومان پلە و جیاوازیەکانی ئەو جیهان زۆر گەورەتر و زۆر زیاترن).

بۆ ئەوانەی کە دەڵێن ئیسلام لە ڕووی سیاسییەوە دواکەوتووە، دەڵێین: ئیسلام یاسایەکی هێناوە کە لە هەموو یاساکانی تر پێشکەوتووترە، لە ڕووی ڕێکخستنی دەسەڵاتەوە، تاکە کەس زۆر ڕێزی لێگیراوە و پێش یاسای مافەکانی مرۆڤ کەوتووە ، بەڵکو لەو یاسایانە بەرزترە.... ئایا لەوە زیاتر تاکە کەس چی دەیەوێت کاتێک ئیسلام بەرزی دەکاتەوە و دەهێنێتە بەرامبەر هەموو مرۆڤایەتی. خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ مِنۡ أَجۡلِ ذَٰلِكَ كَتَبۡنَا عَلَىٰ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ أَنَّهُۥ مَن قَتَلَ نَفۡسَۢا بِغَيۡرِ نَفۡسٍ أَوۡ فَسَادٖ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَكَأَنَّمَا قَتَلَ ٱلنَّاسَ جَمِيعٗا وَمَنۡ أَحۡيَاهَا فَكَأَنَّمَآ أَحۡيَا ٱلنَّاسَ جَمِيعٗاۚ ﴾ المائدە(٣٢). واتە: (لەبەر ئەوەی کارەساتی کوشتنی ناڕەوای ئاوا ڕوونەدات ئێمە پێویستمان کرد لەسەر نەوەی ئیسرائیل ئەوەی کەسێک بە ناحەق بکوژێت و لە جیاتی کوژراوێک نەبێت، یان گوناهو تاوانی گەورەی ئەنجام نەدابێت لە زەویدا( وەکو

جەردەیی و دەستدرێژی و ... هتد)، ئەوە وەك ئەوە وایە هەر هەموو خەڵكی کوشتبێت، ئەوەش کەسێك لە مەرگ ڕزگار بکات، هەروەك ئەوە وایە هەموو خەڵكی لە مەرگ ڕزگار کردبێت و ژیانی پێ بەخشی بن، سوێند بێت بە خوا بە ڕاستی پێغەمبەرانمان بە بەڵگە و موعجیزەی ئاشکرا و دیارەوە هاتووە بۆ لایان ( تا پابەندی حەق و داد بن) کەچی زۆربەیان دوای ئەو ڕێنموویانە، هەر زیادەڕەو بوون لەم سەر زەوەمینەدا لە ستەم و کوشتنی ناحەقدا).

ئەگەر دەسەلاتدارێك تاكێك بە ستەم و بەبێ تاوان بکوژێت، هەروەك ئەوە وایە هەموو خەڵکەکەی کوشتبێت، با چاکسازی و بیناسازی و ئاوەدانی و خزمەتگوزاریش پێشکەش بکات و پیشەسازی و کارگە دابنێت، هیچ سوودێکی بۆ ئەو نییە.

کەواتە تاك لە ئیسلامدا پلە و پایەی لە لووتکەی ڕێزلێناندایە و ڕێزێکی ڕەهای هەیە، کەچی هیچ ئایینێك یان فەلسەفەیەك یان سیاسەتێك لە کۆن و نوێ دا ئەم نرخەی بە مرۆڤ نەداوە ، چونکە مرۆڤ لە سیاسەتدا نرخێکی سنووردار و ڕێژەیی هەیە.....

تاك لە ئیسلامدا لە ناو ماڵی خۆی ئەمینە و نهێنیەکانی دەپارێزێت(نە سیخوڕی و پاشەملێ)هەیە.... هەروەها ئەمینە لە خۆی و خۆراکی و سامانی و سەربەستی خۆی. هەموو شتێك هەتا سلاوکردن، جێکردنەوە بۆ دانیشتن ، وشەی چاك.... هتد. شوێنی خۆی هەیە لە قورئانی پیرۆزدا. بۆ نموونە قورئان بە دەسەلاتدار دەڵێت توند و تاکڕەو مەبە لە بڕیاردان ، پێغەمبەریش هەرچەندە لە لووتکەی چاکی و باشیدایە، بەلام پێی دەڵێت:﴿ نَّحْنُ أَعْلَمُ بِمَا يَقُولُونَ وَمَآ أَنتَ عَلَيْهِم بِجَبَّارٍ فَذَكِّرْ بِٱلْقُرْءَانِ مَن يَخَافُ وَعِيدِ ﴾ ق(٤٥). واتە( ئەی

محەمەد ( صلى الله عليه و سلم) ئێمە چاك ئاگادارین بەوەی کە دەیڵێن و چۆن دژایەتی ئەم ڕاستییە دەکەن! خۆ تۆ زۆردارنیت بەسەریانەوە تا بە زۆر باوەڕیان بەسەردا بسەپێنیت... کەواتە تۆ تەنها ئەوەت لەسەرە کە بە قورئان یاداوەریی ئەو کەسانە بکەیت کە لە هەڕەشەکانی ئێمە دەترسن).

هەروەها پێی دەڵێت:﴿ فَذَكِّرْ إِنَّمَآ أَنتَ مُذَكِّرٌ لَّسْتَ عَلَيْهِم بِمُصَيْطِرٍ ﴾ الغاشیە(٢١ -٢٢). واتە: (کەواتە ( ئەی پێغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم) ئەم شتانە بخەرەوە یادیان و ئامۆژگاریان بکە، بە ڕاستی تۆ هەر یادخەرەوەیت؛ هیچ دەسەڵاتێکت نیە بەسەر دڵ و دەروونیاندا). هەروەها قورئانی پیرۆز داوا دەکات کە عیبادەتی دەسەڵاتدار نەکەین وە پیاوی گەورە بە خوداوەند نەزانین:﴿ ....وَلَا يَتَّخِذَ بَعْضُنَا بَعْضًا أَرْبَابًا مِّن دُونِ ٱللَّهِ .... ﴾ آل عمران(٦٤). واتە:(... نابێت هەندێك لە ئێمە هەندێکی تر وەکو خوداوەند بناسێت، بێجگە لە خودای الله ).

﴿ وَقَضَىٰ رَبُّكَ أَلَّا تَعْبُدُوٓاْ إِلَّآ إِيَّاهُ وَبِٱلْوَٰلِدَيْنِ ... ﴾ الإسراء (٢٣). واتە: (پەروەردگاری تۆ بڕیاریداوە کە جگە لەو کەسی تر نەپەرستن، هەروەها بڕیاریداوە چاکەکاریش بە لەگەڵ دایك و باوکتاندا).

هەروەها داوا دەکات کە ئێمە هەڵچوو و گێل و چاولێکەر و بەدواکەوتووی زۆرینە نەبین:﴿ ....بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْقِلُونَ ﴾ العنكبوت(٦٣). واتە: (....بەڵکو هێشتا زۆربەیان بێ بیر و هۆشن و ژیریان ناخەنەکار). وە دەڵێت: ﴿ وَعْدَ ٱللَّهِ لَا يُخْلِفُ ٱللَّهُ وَعْدَهُۥ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴾ الروم(٦). واتە: (بێگومان ئەوە بەڵێنی خوا خۆیەتی، خوا سەرپێچی ناکات لە بەڵێنەکەی،

بەڵام زۆربەی خەڵکی تەنها ڕواڵەت لە دنیا دەزانن، ئەوانە بێ ئاگا و بێ خەبەرن لە ڕۆژی دوایی و قیامەت). وە:﴿ ...وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يُؤْمِنُونَ ﴾ الرعد(١). واتە: (...بەڵام زۆربەی خەڵکی باوەڕ ناهێنن). وە دەفەرمووێت:﴿ وَإِن تُطِعْ أَكْثَرَ مَن فِى ٱلْأَرْضِ يُضِلُّوكَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ ۚ إِن يَتَّبِعُونَ إِلَّا ٱلظَّنَّ وَإِنْ هُمْ إِلَّا يَخْرُصُونَ ﴾ الأنعام(١١٦). واتە: (خۆ ئەگەر فەرمانبەردار و ملکەچی زۆربەی خەڵکی سەر زەوی بیت ئەوە لە ڕێبازی خوا وێڵت دەکەن، چونکە شوێنی هیچ شتێك ناکەون جگە لە گومان و تەنها گۆترەکاری دەکەن).

هەروەها قورئان داوا دەکات کە مرۆڤ ڕەگەز پەرست و نەژاد پەرست نەبێت: ﴿ ...إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ ٱللَّهِ أَتْقَىٰكُمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ ﴾ الحجرات(١٣). واتە: (...بە ڕاستی بەڕێزترینتان لای خوای گەورە ئەو کەسانەتانە کە زۆرتر لە خواترسە و فەرمانبەرداری خوایە، بێگومان خوا زانا و ئاگایە بە هەمووان). هەروەها دەڵێت: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُوا۟ رَبَّكُمُ ٱلَّذِى خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَٰحِدَةٍ ... ﴾ النساء(١).واتە: ( ئەی خەڵکینە لە خەشم و ناڕەزایی ئەو پەروەردگارەتان خۆ بپارێزن کە ئێوەی لە تاکە نەفسێك دروست کردووە...).

بە مانای زانستی ئیسلام هەردوو ئاوێتەی دیالۆگی لە خۆ دەگرێت ، ماددییەتی یەهوودی و ڕۆحانیەتی مەسیحی، دادپەروەریەکی توند و وشك کە دەڵێت: ددان بە ددان ، وە چاویش بە چاو ، لەگەڵ خۆشەویستی و لێبوردەیی و ئەوپەڕی سستی کە دەڵێت: هەر کەسێك زەڵەیەکی لە ڕوومەتی ڕاستت دا، ئەو کات ڕوومەتی چەپیش بۆ دابنێ تا زەڵەیەکی لێ بدات.

قورئانی پیرۆز هات بە پەیڕەوێکی ناوەند لە نێوان ئەو تەوراتەی دەستکاری کراوە و بۆتە کتێبێکی ماددی و دونیایی، کە هیچ بابەتێکی دوا ڕۆژی تێدا نابینرێت، هەروەها ئەو ئینجیلەی کە بە تەواوی لار بووە بۆ لای ڕۆحانیەت و رەهبانیەت. قورئان بانگەوازی کرد بۆ یاسایەکی بە بەزەیی کە دادپەروەری و خۆشەویستی لە خۆ دەگرێت. تێیدا هاتووە کە بەرگری کردن لە خۆت مافێکە پێت دراوە ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لێبوردەیی و لێخوشبوونی پێ باشترە لە تۆڵەسەندنەوە ، خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ ...وَإِن تَعۡفُواْ وَتَصۡفَحُواْ وَتَغۡفِرُواْ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٌ ﴾ التغابن(١٤). واتە: (.. جا ئەگەر چاوپۆشی لە هەڵەیان بکەن و واز لە ئازاردانیان بهێنن و لێیان ببورن، ئەوە چاك بزانن کە خوا بێخۆشبووە و میهرەبانە). هەروەها دەفەرمووێت:﴿ وَلَمَن صَبَرَ وَغَفَرَ إِنَّ ذَٰلِكَ لَمِنۡ عَزۡمِ ٱلۡأُمُورِ ﴾ الشوری(٤٣). واتە:(لە ڕاستیدا ئەوەی دان بە خۆیدا بگرێت و چاوپۆشی بکات لێخۆشبوو بێت، بە ڕاستی ئەوە کارێکی بەجێ و چاك و پەسند ئەنجام دەدات، بەڕاستی ئەوە لەو کارانەیەکی پێویستە بکرێت).

ئەگەر لە سیستەمی سەرمایەداریدا ڕێگا بە تاکە کەس درابێت بە هەموو ڕێگایەك و بەبێ بەربەست سامان کۆ بکاتەوە و خەڵك بچەوسێنێتەوە، هەروەها سیستەمی کۆمۆنیستی کە ئەم سەربەستییە بە هەموو شێوەیەك لە تاکە کەس دەسێنێت ، لەو کاتە ئیسلام چارەسەری مامناوەند پێشکەش دەکات و دەڵێت:﴿ ...لِّلرِّجَالِ نَصِيبٞ مِّمَّا ٱكۡتَسَبُواْۖ وَلِلنِّسَآءِ نَصِيبٞ مِّمَّا ٱكۡتَسَبۡنَۚ

وَسْـَٔلُوا۟ ٱللَّهَ مِن فَضْلِهِۦٓ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمًا ﴾ النساء(٣٢).واتـه: ( پیاوان بەشێکیان هەیە لەوەی کە بە دەستیان هێناوە، هـەروەها ئافرەتـانیش بەشێکیان هەیە لەوەی کە بەدەستیان هێنـاوە، هەمیـشە و بـەردەوامیش داوای زیادە و بەخشش و بەهرەی خوا بکەن، چونکە بەڕاستی خوا بە هەموو شتێك زانایە). کەواتە تاکە کەس سەربەستە لە کارکردن و کۆ کردنـەوە ، بـەڵام بـۆی نییە هەموو قازانجەکـە بـۆ خـۆی بێـت، بـەڵکو دەبێـت هـەژاریش بەشـی خـۆی هەبێت کە دەبێت لە ٢,٥٪ لێی بدات. ئەم بەخشینە چاکەیەك نییە دەی کەی، بەڵکو ئەمە مافێکی خوداییە لـە قازانجەکـە..... بـەم هاوکێـشە جوانـە ئیـسلام توانی سەربەستی تاکە کـەس بپارێزێـت و مـافی هـەژاریش دابـین بکـات. هـەر لەبەر ئەوە قورئانی پـیرۆز ڕوو دەکاتـە موسڵمانان و پێیـان دەڵێـت:﴿ وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَٰكُمْ أُمَّةً وَسَطًا لِّتَكُونُوا۟ شُهَدَآءَ عَلَى ٱلنَّاسِ ... ﴾ البقـــرە(١٤٣). واتـــە: (بەو شێوەیەش ئێوەمان بە گەلێکی میانەڕەو گێـڕاوە تـا ببنـە شـایەت بەسـەر خەڵکییـــەوە.....)... هـــەر لـــە ســـەر ئـــەم بنـــچینەیە ئیـــسلام دادپـــەروەری هەڵبژاردووە لەگەڵ هەموو شتێك.

ئەم ناوەندێتیە نەك ناوەندێکی ژمێریارییە، بەڵکو ناوەندێکی دیالۆگییـە. یـان ئاوێتەیەکە کـە هـەموو نـاکۆکی و دژایەتییـەکان لـە خـۆی دەگرێـت ( ڕاسـت و چەپ )، هەروەها لێیان تێپەر دەبێت لە سەریان زیاد دەکات ، هەر لەبەر ئـەوە لە ئیسلامدا ڕاست و چەپ نییە، بەڵکو تەنها ڕێگایەکی ڕاست و دروست هەیە، کە پێی دەڵێن ( ڕێگای ڕاسـت ) هەرکەسێك لـەم ڕێگەیـە بـەلای ڕاسـت یـان چەپیدا لابدات کەواتە لە ڕاستی دەرچووە.

له ئیسلامدا هیچ دەستوورێکی سیاسی دیاریکراو و چوارچێوەکراو نییە، کە خەڵك پێوە ببەسترێنەوە ، چونکە خودای گەورە دەزانێ کاتەکان بەردەوام لە گۆڕانکاریدان و پێویستی بە گۆڕانکاری هەیە، لە سیاسەت و حکومڕانیدا، کە دەرگا دەکاتەوە بۆ بڕیاردان لەسەر بابەتە جۆراوجۆرەکان و دانانی دەستوور کە بکرێت لە کاتی پێویستدا دەستکاری بکرێت. بۆ ئەوەی دەرگا بۆ موسڵمانان کراوە بێت و بتوانن دانوستان و گۆڕانکاری بکەن بەپێی ئەو زانستانەی کە لەبەر دەستیان دایە، لە هەموو سەردەمێك، نەك کۆببنەوە لەسەر دەستوورێکی دیاریکراوی نەگۆڕ.

لەبەرئەوە قورئانی پیرۆز تەنها هەندێك دەستپێشخەری سیاسی گشتی بۆمان باس دەکات، وەك تایبەتمەندی و سیفاتی حوکمرانی نموونەیی، نامانبەستێتەوە بە بیردۆزێکی سیاسی دیاریکراوەوە ، کە ئەمەش نهێنیەکی دیارە لە نهێنی و موعجیزەکانی قورئانی پیرۆز، نەوەك کەم و کورتی و نەداری لەم ڕووەوە.

کە ئەمەش پێشەکییەکی قورئانە لە پێش هەموو پێشەکیەکان هاتووە ، وەڵامی ئەو کەسانە دەداتەوە کە دەڵێن ئایین نەجوڵاو جێگیر وچەقبەستووە .... ئیسلامیش هیچ کاتێك جێگیر و چەقبەستوو نەبووە، بەڵکو هەردەم و بەردەوام ئایین بۆچوون و هزرین و پێشخستن و گۆڕانکاری بووە ، بە بەڵگەی چەند ئایەتێك ، لەوانە:﴿ قُلْ سِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَانظُرُوا كَيْفَ بَدَأَ الْخَلْقَ ۚ ثُمَّ اللَّهُ يُنشِئُ النَّشْأَةَ الْآخِرَةَ ۚ إِنَّ اللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴾ العنكبوت(٢٠). واتە: (ئەی محمد پێیان بڵێ: با بگەڕێن بە زەویدا، تەماشابکەن و سەرنج بدەن چۆن ئەو زاتە دروستکراوانی بەدیهێناوە، لەوەو دواش هەر خوا سەر لە نوێ

بەرپایان دەکاتەوە، بە ڕاستی خوا دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا هەیە) .

هەروەها دەڵێت:﴿ فَلْيَنظُرِ ٱلْإِنسَٰنُ مِمَّ خُلِقَ خُلِقَ مِن مَّآءٍ دَافِقٍ يَخْرُجُ مِنۢ بَيْنِ ٱلصُّلْبِ وَٱلتَّرَآئِبِ ﴾ الطارق(٥-٧). واتە: (کەواتە با ئادەمیزاد تەماشا بکات و سەرنج بدات کە لە چی دروستکراوە؟، دروستکراوە لە ئاوێکی هەڵقوڵاوە، لە نێوان بڕبڕەکانی پشت و ئێسکەکانی سینەدا دەردەچێت) . هەروەها دەفەرموێت:﴿ أَفَلَا يَنظُرُونَ إِلَى ٱلْإِبِلِ كَيْفَ خُلِقَتْ وَإِلَى ٱلسَّمَآءِ كَيْفَ رُفِعَتْ وَإِلَى ٱلْجِبَالِ كَيْفَ نُصِبَتْ وَإِلَى ٱلْأَرْضِ كَيْفَ سُطِحَتْ ﴾ الغاشیە(١٧-٢٠). واتە: (ئایا ئێوە سەرنجی وشتر نادەن چۆن دروستکراوە؟ ئایا سەرنجی ئاسمان نادەن چۆن بەرزکراوەتەوە؟ ئەی سەرنجی کێوەکان نادەن، چۆن داکوتراون و دامەزرێنراون، ئەی سەرنجی دەشتەکانی زەوی نادەن چۆن تەخت کراوە..)؟!

ئەمانە چەند داواکارییەکی ڕوون و ئاشکران بۆ لێکۆڵینەوە و بیرکردنەوە، لەبارەی چۆنیەتی دروستکردنی مرۆڤەکان، گیانلەبەران ، چیاکان ، زەوی و ئاسمان و ئەستێرەکان.... توێکاری زانستی و دەروونزانی، زیندەوەرزانی و زانستی دروست بوونی کۆرپەلە، ئەوانە هەموویان داواکارن بۆ ئەوەی بگەڕێین لەسەر زەوی ، بەڵگە بدۆزینەوە و یاساکان بزانین کە چۆن بوونەوەرەکان دروستکراون. کە ئێستا ئەم هەموو زانستانە فێربووین بەهۆی زانستی پەرەسەندن..... دیسان ئیسلام فێرمان دەکات کە هیچ کاتێك لە هەڵە کردن نەترسین، بەڵکو ئەوەی خۆی ماندوو دەکات بۆ دۆزینەوەی چارەسەرێك، ئەگەر هەڵەش بکات هەر پاداشت دەکرێت.

ئـەوەش ڕاسـت نییـە کـە دەڵـێن ئێمـە بـەهۆی پابەنـدبوونمان بـە ئایینـەوە دواکەوتووین ، ڕۆژئاواش بەهۆی ڕەت کردنـەوەی ئایینـەوە پێشکەوت ، بـەڵکو لـە ڕاسـتیدا ئێمـە دواکـەوتین کاتێـك ئایینمـان پـشتگوێ خـست.... کاتێـك موسڵمانەکان لە ژێر ڕۆشنایی ئایەتەکان کاریان دەکرد پێشکەوتوو بوون ، لەو کاتـە دەوڵـەتێك هـەبوو لـە دەریـاوە بـۆ کەنـداو هـەروەها زانـای وەکـو ئـیبن سینامان هـەبوو لـە پزیـشکی . ئـیبن روشـد لـە فەلـسەفە ، ئـیبن هەیـسەم لـە بیرکاری ، ئیبن نەفیس لە توێکاری ، جابری کوڕی حەیان لە کیمیاء و.....هتد لەوکاتـە هـەموو دونیـا زانـستی لای ئێمـە وەردەگـرت، هـەتا ئێـستاش کۆمەڵـە ئەستێرەکان بە هەمان نـاوی عـەرەبی نووسـراون لـە کتێبـە ئەوروپیـەکان..... هـەروەها تـا ئێـستا دەزگـای دڵۆپانـدن لـە فەرنـسی هـەر بـە زمـانی عـەرەبی دەنووسـن ( أمبیـق ). کەواتـە عەرەبـەکان بـە زانـست پێشکەوتن نـەك بە بـێ باوەڕی.

لە سەدەکانی ناوەڕاستدا لـە ئـەوروپا ئـەم تێکەڵییـە و دوورکەوتنـەوە دروست بوو، کاتێك کلێسا زاڵ بوو بەسەر خەڵکیدا و دادگاکانی لێکۆڵینەوە پەیدا بوون ، لەوکاتـە زاناکـان دەستبەسـەربوون، (گـالیلوو) خرایـە بەندیخانـەوە،( برۆنـۆ) سووتێنـرا ، لەو کاتەوە هەموو شـتێك کەوتـە دەسـتی کلێـسا و پاپاکـان، لەسـەر ئامانجـە جوانـەکانی ئـایینی مەسـیحی لایانـدا ، سـەردەمی دواکـەوتن دەسـتی پێکـرد.... هەڵەکـە لێرەوەیـە کاتێـك ڕەخنـەگرەکان دێـن ئـەم ڕووداوانـە شیدەکەنەوە بەسـەر ئیـسلامدا دەهێننـەوە، ئەمـەش هەڵەیـەکی گەورەیـە...... چونکە ئیـسلام وەکـو ئـایینی پاپاکان نییـە، هـیچ کاتێك ئیسلام واسیتە لـە نێوان خودا و مرۆڤەکان دانانێت ، لەو کاتەی ئیسلام دەسەڵاتی هەبوو ئەوکات

سەردەمی پێشکەوتن بوو ، کە ئەمەش نەك تەنها شتێکی گوتراوە، بەڵکو ڕووداوی ڕاستەقینەیە مێژوو بۆمان باس دەکات.

ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز داوامان لێدەکەن کە زانستخواز بین ، هیچ دژایەتی لە نێوان زانست و ئاییندا نییە. خودای گەورە دەفەرموویت:﴿ ....وَقُل رَّبِّ زِدْنِي عِلْمًا ﴾ طە(١١٤). واتە:(.. بڵێ خودایە زانستم زیاد بکە) ، هەروەها:﴿ ....قُلْ هَلْ يَسْتَوِي الَّذِينَ يَعْلَمُونَ وَالَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ إِنَّمَا يَتَذَكَّرُ أُولُوا الْأَلْبَابِ ﴾ الزمر(٩). واتە: (ئەی پێغەمبەر ( صلى الله عليه و سلم): ئایا ئەو کەسانەی کە دەزانن و شارەزان، وەك ئەوانەن کە هیچ نازانن و شارەزاییان نییە؟ بە ڕاستی تەنها خاوەن بیر و هۆشەکان لەم جۆرە یاداوەریانە سوود وەردەگرن و تێدەگەن ) ؟!

.وە:﴿ شَهِدَ اللَّهُ أَنَّهُ لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ وَالْمَلَائِكَةُ وَأُولُو الْعِلْمِ قَائِمًا بِالْقِسْطِ لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ ﴾ أل عمران(١٨). واتە: (خوای گەورە خۆی شایەتی داوە و دەریخستووە و سەلماندوویەتی کە بەڕاستی جگە لەو هیچ خوایەکی تر نییە کە شایانی پەرستن بێت، هەروەها فریشتەکان و خاوەن زانستەکانیش کە بە ڕێگەیەکی ڕاست و دروست دەیسەلمێنن خوا هەمیشە دادپەروەری ڕەهایە و جگە لەو زاتە خوایەکی تر نییە و ئەو خوایەکی بالادەست و دانایە)..... لەم ئایەتە پیرۆزەدا ناوی فریشتە و خاوەن زانست لەگەڵ ناوی خودا پێکەوە گرێدراون.

یەکەم ئایەت، بەڵکو یەکەم وشە لە قورئاندا ( إقرأ ) بوو ، واتە: بخوێنە. هەروەها لە قورئان زاناکان خودای گەورە پلەو پایەیان بەرز دەکات لەبەر ئەم

زانستەی کە پێیانە:﴿ ...يَرْفَعِ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مِنكُمْ وَٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ دَرَجَٰتٍ ۚ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ ﴾ المجادلە(١١). واتە: (... جا ئەگەر واتان کرد خوای گەورە ئەوانەی ئیمانیان هێناوە لە ئێوە و ئەوانەشتان زانست و زانیاریان پێدراوە چەندەها پلەو پایە بەرزیان دەکاتەوە، خوایش ئاگایە بەو کار و کردەوانەی کە ئەنجامی دەدەن)....

وشەی ( العلم ) یاخود زانست لەگەڵ برگە لێ دروست کراوەکان ( ٨٥٠ ) جار لە قورئاندا هاتووە... باشە چۆن دەتوانن بڵێین لەمەولا دژایەتی لە نێوان ئایین و زانستدا هەیە ، یان بڵێن ئایین ڕێگا بە زانست نادات .

کەواتە فێربوون و تێگەیشتنی ئایین شتێکی پێویستە، مێژووی ئایینی ئیسلامیش هەمووی بزووتنەوە بووە بۆ زیندوو کردنەوە و پێشخستنی ئایین..... قورئان زۆر دوورە لەو تۆمەتەی کە دەڵێت ڕێگرە لە خەڵك بۆ فێربوون ، بەڵکو ئایینمان پێشکەوتن و پەرەسەندنی لای قەبووڵە. بێجگە لە بیروباوەڕ و ناوەڕۆکی شەریعەت نەبێت. چونکە خودا هەریەکە و پەرەناسێنێت بۆ دوو یان سێ.... ئەمە شتێکی کۆتاییە....... چاکەش هەر چاکەیە و خراپەش هەر خراپەیە . کوشتن نابێتە کارێکی باش، هەروەها دزی کردنیش نابێتە کارێکی باش ، درۆ نابێتە ڕەوشت بۆ مرۆڤە چاکەکان.

کەواتە بێجگە لە بیروباوەڕ و ناوەڕۆکی شەریعەت ، هەموو شتێك کراوەیە بۆ بیرکردنەوە و ڕادەبرین و زیادکردن و پەرەسەندن ...... بنچینە و ناوەڕوکی ئیسلام بە عەقڵ و لۆژیك وەرگیراوە ، گفتوگۆ و ناکۆکی قەبووڵ دەکات و هانمان دەدات کە عەقڵ و لۆژیك لە هەموو کارەکانمان بەکاربێنین.

هەروەها لە زۆر شوێن لە قورئانی پیرۆزدا وشەی ( أفلا تعقلون ) و ( أفلا يفقهون ) دەبینین ، ئەوانەی خاوەن باوەڕن بە ( أولوا الألباب ) ناودەبرێن، واتە خاوەن عەقڵ و هۆشەکان . خودای گەورە دەفەرموویت: ﴿إِنَّ شَرَّ ٱلدَّوَآبِّ عِندَ ٱللَّهِ ٱلصُّمُّ ٱلۡبُكۡمُ ٱلَّذِينَ لَا يَعۡقِلُونَ﴾ الانفال(٢٢). واتە: (بە ڕاستی خراپترین زیندەوەران لای خوا ئەو کەسانەن کە کەڕن و لاڵن، ئەوانەی کە ژیر نابن). وە دەفەرموویت:﴿ أَفَلَمۡ يَسِيرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَتَكُونَ لَهُمۡ قُلُوبٞ يَعۡقِلُونَ بِهَآ أَوۡ ءَاذَانٞ يَسۡمَعُونَ بِهَاۖ ... ﴾ الحج(٤٦). واتە: ( ئایا ئەوانە بەسەر زەویدا نە ڕۆیشتوون بە دڵ و دەروونێکی هوشیارەوە تا بیرێك بکەنەوە یان خاوەنی گوێ و دەزگای بیستن نەبوون) ؟!.....

بەم شێوەیە ڕێزلێنانی عەقڵ کرۆکی ئایینە ، کراوەیی مرۆڤیش پاڵپشتی ئایینە ، شۆڕشگێڕانیش ڕۆحەکەیەتی ، هیچ کاتێك ئیسلام ڕێگر و نێگەتیڤانە نەبووە. خودا دەفەرموویت:﴿ وَقَٰتِلُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ٱلَّذِينَ يُقَٰتِلُونَكُمۡ وَلَا تَعۡتَدُوٓاْۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُعۡتَدِينَ ﴾ البقرە(١٩٠). واتە: (بجەنگن لە پێناوی ڕێبازی خوادا دژی ئەوانەی کە دژتان دەجەنگن، نەکەن دەستدرێژی بکەن، چونکە بە ڕاستی خوا ئەو دەستدرێژکەرانەی خۆش ناوێت). هەروەها دەفەرموویت:﴿ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلَّذِينَ يُقَٰتِلُونَ فِي سَبِيلِهِۦ صَفّٗا كَأَنَّهُم بُنۡيَٰنٞ مَّرۡصُوصٞ ﴾ الصف(٤).

واتە: (بە ڕاستی خوا ئەو کەسانەی خۆشدەوێت کە دەجەنگن لە پێناو ڕێبازی خوادا بە یەك ڕیز و یەك پارچە و یەك دڵ، چونکە هەروەك کۆشکێکی

بەرزی قایمی داڕێژراون بە قوڕقوشم).... کەواتە شەڕ لەپێناو خودا بە نەفس و منداڵ و سامان .. شەڕ و خۆڕاگری هەڵنەگەڕانەوە و بەرەنگاربوونەوە و ئارامگری و خۆڕاگری کرۆکی ئایینمانە.

باشە ئەگەر ئایینێك حاڵ بەم شێوەیە بێت، نەرمی ، عەقڵی ، زانستی ، کراوەیی ، شۆڕشگێڕی ، چۆن دەکرێت تۆمەتبار بکرێت بە ئایینێکی وشك ، چەقبەستوو و ڕەق لە لایەن برادەرێکەوە وەکو ئەو دکتۆرەی لە فەرەنساوە گەڕاوەتەوە و ، هیچ شتێك لە ئایینی خۆی نازانێت و پیتێکیشی لە قورئان نەخوێندووە !.

# بــــــەشی هەشتەم

## - گــیـــــان(رۆح)

دکتۆری هاوڕێم دەیزانی ئەم جارە ئاریشەکە قورسە، بۆیە گوتی: بەڵگەت چییە کە مرۆڤ ڕۆحی هەیە و دوای مردنیش زیندوو دەبێتەوە ؟
مرۆڤیش تەنها ئەو جەستەیە نییە کە دەبێتە خۆڵ... ڕای ئایینتان چییە لەبارەی پەیوەندیکردن بە ڕۆحەکان یان ئامادەکردنی ڕۆحەکان؟!
پاش کەمێك بیرکردنەوە گوتم: گومانی تێدا نییە پرسیارەکەت ئەمڕۆ قورسە ، چونکە قسەکردن لەسەر ڕۆح بزربوونێکە، ڕاستیەکان لەبارەی ڕۆح زۆر کەمن ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لای ئێمەن نەك لای ئێوەن...... ماوەیەك بیرم کردەوە پاشان گوتم: لەگەڵم بیربکەرەوە .... یەکەم نیشانەی یارمەتیدەر بۆ ئەوەی ببێتە بەڵگە لەسەر هەبوونی ڕۆح، ئەویش ئەوەیە کە سروشتی مرۆڤ دوو شتە: یەکەمیان جەستەیەکی سروشتی دیار و بینراوە، کە هەموو سیفەتە ماددیەکانی تێدایە ، بەرگەی کێشان و پێوانی هەیە، دەکەوێتە بۆشاییەك و لە

کاتێکی دیاری کراودا بەردەوام لە جوڵەدایە و لە بارێکەوە بۆ بارێکی تر گۆڕانکاری بەسەردا دێت، جار بەجار ئەم جەستەیە حاڵ دەگۆڕێت لە کاتێك تەندروستە، پاشان نەخۆشی ڕووی تێدەکات، قەڵەو دەبێت، پاشان لاواز دەبێت، هەندێك جار چالاکە و هەندێك جار تەمبەڵە ، دەخەوێت و بەئاگا دێت ، تێر دەبێت، پاشان برسی دەبێت ، ئەم جەستەیە پاشکۆیەکی هەیە ، کە ئەویش شەریتێکە پڕە لە هەست و سۆزو ئارەزوو و ترس، بە بەردەوامی دەجوڵێن و کاردەکەنە سەر مێشکی مرۆڤ ...... ئەم جەستەیە بەم سیفەتانە لەگەڵ ئەم شەریتە هەر هەموویان تایبەتمەندی ماددیان هەیە...... کەواتە دەڵێین: جەستە و نەفسە ئاژەڵیەکەی مرۆڤ ، هەردووکیان لە ماددەن... بەڵام بەرامبەر ئەمانە؛ سروشتێکی تر لە ناخی مرۆڤدا هەیە تەواو پێچەوانە و هاودژ و جیاوازە لەگەڵ سروشتی یەکەم، کە سروشتێکە خاوەن سیفەتگەلێکە جێگیر و بێ جوڵە و بەردەوامە، نە شوێن و نە کاتی هەیە...... ئەویش ئەقڵە. بە پێوەرە جێگیرەکانییەوە ، بە بڕیار و گوتنەکانی...... هەروەها ویژدانە بە حوکمەکانی. هەروەها ئەو هەستە جوانەیە کە هەموو جوانییەکە.. وە ئـــەو ( مـن )ە یـە کـە هـەموو سیفەتەکانی عـەقڵ و ویـژدان و هەسـتی جـوان و ڕەوشتی چاکە.

کەواتە ئەو ( من )ە زاتێکی قووڵ و سەربەستە، بە ڕێگای ئەم زاتە و شتە و کەسە لەم هەموو جیهانە..... لێرەیە و بەردەوامیش لێرەیە...... هەستێکی جێگیرە و بەرەو هەموو لایەکە ، گۆڕانکاری بەسەردا نایەت ، قەڵەو و لاواز نابێت ، نەخۆش ناکەوێت ، پەیوەندی بە کاتەوە نییە ، ئێستا و رابردوو. دوا ڕۆژی تێدا نییە..... بەڵکو ئەو ( من )ێکی هەمیشەیی و بەردەوامە ناڕوات ،

هەروەکو چۆن رابردوو دەڕوات، بەڵکو بەهۆی هەستەوە بەردەوام دەمێنێت بەبێ کۆتایی.

لێرەوە هەبوونێکی تر هەیە نەك بە سیفاتە ماددیەکان ، گۆڕانکاری بەسەردا نایەت ناگەوێتە شوێن و کاتەوە ، کێش و پێوان قەبووڵ ناکات.... بە پێچەوانەوە دەبینین هەبوونێکی جێگیرە و هەموو ئەوانەی گۆڕانکاری بەسەریاندا دێت پێی بەراورد دەکەین ، هەموو شتێکی بێ سنوورە کە دەتوانین شتە سنوردارەکان بناسین لە جیهانی ماددەدا.

باشترین شت کە ئەم هەبوونە پێ بناسین دەڵێین ئەمە ڕۆحە ، سروشتی ڕۆحی هەیە ، لێرەوە بۆمان هەیە بپرسین ئایا کامیان لەم دوو سروشتە هەقیقەتی مرۆڤ دەردەخەن؟ ئایا بەڕاستی مرۆڤ جەستەیە، یان روحە ؟ بۆ ئەوەی وەڵامەکەی بزانین. دەبێت لێکۆڵینەوە بکەین تا بۆمان ئاشکرا بێت ئاخۆ کامەیان زاڵە بەسەر ئەوی تردا ، یاخود کامیان ئەوی تر بەڕێوە دەبات؟.

زانا ماددییەکان دەڵێن مرۆڤ جەستەیە و ، جەستە زاڵە بەسەر ئەو هەموو ئەو شتانەی کە باستکرد وەکو عەقڵ ، لۆژیك ، هەستی جوانی ، هەستی ڕەوشتی ، ویژدان ، ئەو پێکهاتەی کە پێی دەڵێن ( زات ) ، یان ( من ). هەمووی پاشکۆی جەستەیە ، شتێکی سەرەتاییە، بە جەستە کار دەکات و خزمەتی ئەو دەکات و هەموو ئارەزوو هەوەستەکانی جێبەجێ دەکات.......

ئەمە قسەی ماددییەکانە، کە بێگومان هەڵەیە، چونکە لە ڕاستیدا جەستە پاشکۆیە، داوا لێکراوە نەك داواکەرە ، جەستە ناتوانێت برسی نەبێت و ڕێگر بێت لە خواردن و خواردنەوە ، کاتێك ئێمە رۆژوو دەگرین ئایا لەو کاتە هەست و ئارەزوویە هانمان دەدات خواردن بخوین یان جەستەیە ؟!

کاتێك بەیانی لە خەو هەڵدەستین جەستە هەر لە خۆیەوە دەستدەکات بە کارکردن ، هەرچی عەقڵ بڕیاری لەسەر داوە جەستە یەك بە یەك جێبەجێ دەکات ، ئایا کامیان شوێنکەوتووی ئەوی ترە . عەقڵ بەدوای جەستە دەکەوێت یان جەستە بەدوای عەقڵ دەکەوێت ؟!

مرۆڤێك گیانی بەخت دەکات و کۆمەڵێك تەقەمەنی لە پشتی خۆی دەبەستێت بەرەو دوژمن دەڕوات، بۆ ئەوەی خۆی بتەقێنێتەوە ، لەو کاتە ڕۆڵی جەستە چییە ؟ چ سوودێکی پێ دەبەخشێ کاتێك دەتەقێتەوە ؟ کامیان بڕیاردەرە جەستە یان ڕۆح ؟ ... هەر ڕۆحە بڕیار دەدات کە جەستە لەناو بچێت ، هیچ ڕێبازێکی فەلسەفی ناتوانێت بۆمان روون بکاتەوە لە پێناو چ سوودێکی ماددی جەستە لەناو بچێت ؟ یان بتوانێت بەرگری لە خۆی بکات بۆ ئەوەی ئەم کارە روونەدات ؟ هیچ هێزێکی بەدەستەوە نییە تا بەرەنگاری بێتەوە . تەنها ئەوە نەبێت کە لەناو دەچێت... لێرە بەدیار دەکەوێت کام لەم دوو هەبوونە گەورەترە.... کام لەم دوو سروشتانە هەقیقەتی مرۆڤ دەردەخەن.

لەم سەردەمەدا چەندین بەڵگەمان هەیە کە جەستە هەبوونێکی سەرەتاییە.... ئەم ڕووداوانەی دەبنە هۆی بڕینی یان لەناوچوونی ئەندامێکی جەستە ، هەروەها گۆڕینی ئەندامەکان، هەبوونی دڵێکی ئەلیکترۆنی یان گورچیلەی پلاستیکی ، یان بانکی خوێن ، بانکی چاوەکان ، کۆگاکانی ئەندامانی لەشی مرۆڤ ، ئەمانە و زیاتریش هەموویان بەڵگەن بەدەستمانەوە.

با نەبێتە جێگای پێکەنین ئەگەر بڵێین لە ساڵی ٢٠٠٠ لەوانەیە زاوا بچێتە لای بووك، دەبینێت ددانەکانی دادەنێت و قژی دروستکراو دادەنێت ، چاوی

پلاستیکی لەگەڵ دوو پێی دروستکراو دادەنێت تەنها لاشەیەك دەمێنێتەوە وەکو لاشەی ئۆتۆمبێلێك کاتێك هەموو شتێکی لێدەکرێتەوە تەنها شاسییەکەی دەمێنێتەوە.

تا ئەم ڕادەیە دەتوانێت ئەندامەکانی جەستە لێبکرێنەوە بەبێ ئەوەی کەسایەتی مرۆڤ بگۆڕدرێت. چونکە دەست ، پێ ، قژ ، چاو، ئەندامەکانی تر، مرۆڤی ڕاستەقینە نین..... ئەوانە نامێنن یان دەگۆڕدرێن یان لە بری ئەوان شتی دروستکراو دادەنێن......

مرۆڤ بریتی نییە لەو ئەندامانە ، چونکە مرۆڤ ڕۆحە لە ئەندامەکانی سوار دەبێت و بەڕێوە دەبات... وەکو ئەنجومەنی بەڕێوەبەرایەتی دەمارەکان و خانەکانی مێشکە ، کە خۆیان مێشك نین ، نموونەی مێشك وەکو خانەکانی جەستەیە، هەندێك داواکاری بۆی دەچێت و ئەنجامی دەدات ، بەڵام لە ڕاستیدا تەنها وەکو دەستەوانەیەکە لەبەری دەکات. ئەم دەستە شاراوەیە ناوی ڕۆحە . کەواتە ڕۆح لە جیهانی ماددیدا کارەکان ئەنجامدەدات...... لەم هەموو نموونانە بۆمان روون دەبێتەوە کە مرۆڤ دوو سروشتی هەیە ، سروشتێك بنچینە و بەڕێوەبەرە کە ئەویش ڕۆحە ، سروشتی دووەم سەرەتایی و لەناوچووە کە ئەویش جەستەیە.

ئەوەی کە بە مردن ڕوودەدات ڕاستیەکەی ئەوەیە ، سروشتی لەناوچوو بەرەو نەمان دەچێت ، سروشتی هەرە زیندوو بەرەو نەمری دەچێت ، جەستە دەبێتە خۆڵ ، ڕۆحیش بەرەو جیهانی زیندووی هەتا هەتایی دەچێت.

بۆ ئەوانەی حەزیان لە فەلسەفەیە بەڵگەیەکی تر دەهێنینەوە لەسەر هەبوونی ڕۆح، کە ئەویش ئەو تایبەتمەندییە کە جوڵانی پێ دەناسێتەوە....

ئێمە دەزانین کە ناتوانرێت هەست بە جوڵە بکرێت تەنها لە دەرەوەی جوڵە نەبێت.

ناکرێت هەست بە جوڵە بکەی لەو کاتەی کە لەگەڵ تەنەکەدا لە هەمان بازنە دەخولێیتەوە ، بەڵکو دەبێت لە شوێنێك لەسەر شتێك ڕاوەستیت تا هەست بە جوڵەی تەنەکە بکەی .... لەبەر ئەوە لەو کاتەی لەگەڵ تەنەکە دەخولێیتەوە ، تۆش جوڵاوی، ناتوانێت بڕیار بدەی تەنەکە جولاوە یان ڕاوەستاوە ، چونکە هەردووکتان وەکو یەك تەن وان کە هەمان جوڵەیان هەیە . لە کاتی وەستان لە شوێنێکی جێگیر دەتوانی هەست بە جوڵەی تەنەکان بکەی.

بە هەمان شێوە مرۆڤ ناتوانێت جوڵەی شەمەندەفەرێك بزانێت ئەگەر لەناو شەمەندەفرەکە دابێت ، تەنها لە کاتی دەستپێکردنی جوڵە نەبێت ، یان کاتێك سەرت لە پەنجەرە دەهێنیتە دەرەوە، یان لە کاتی وەستان لەسەر شۆستەکە...... ئێمە ناتوانین هەست بە جوڵەی رۆژ بکەین ئەگەر لەسەر رۆژ بین، هەروەها ناتوانین هەست بە جوڵەی زەوی بکەین تەنها ئەگەر لە بۆشاییدا یان لەسەر مانگەوە هەست پێ دەکرێت.... تۆ ناتوانیت هەست بە جوڵەیەك بکەی تەنها لە دەرەوەی جوڵەکەوە نەبێت........

لەبەرئەوە ئێمە هەست بە ڕۆیشتنی کاتمان نەدەکرد ئەگەر ئەم ڕۆحەمان نەبوایە، کە لە دەرەوەی کاتدایە ، یان لەبەر دەرگای هەتا هەتایی ( خلود ) ڕاوەستاوین..... ئێمە ئەگەر هەستمان لەگەڵ میلی چرکەکان جولابایە؛ هەستمان بە ڕۆیشتنی چرکەکان نەدەکرد، هەروەها زانیاریمان نەدەڕۆیشت هەروەکو چۆن چرکەکان دەڕۆن...... ئەمە ئەنجامێکی سەرسوڕهێنەرە بۆ گەیاندنی ئەو واتایەی کە دەبێت بەشێك لە ئێمە هەبێت لە دەرەوەی کات

بێت ، یاخود هەرە زیندوو بێت ، کە بە هۆی ئەوەوە هەست بە کات دەکەین ، هەست پێدەکات بەبێ ئەوەی تێوە گلابێت . لەبەرئەوە گەورە نابێت ، پیر نابێت و ناڕوات. ئەو ڕۆژەی جەستە دەبێت بە خۆڵ ، ئەو هەر بە زیندوویی دەمێنێت و ژیانی تایبەتی خۆی دەباتە سەر لە دەرەوەی کات، کە ئەویش ڕۆحە .

ئێمە هەمووومان دەتوانین لە ناخی خۆمان هەست بە هەبوونی ڕۆح بکەین، لە سەر شێوەی ئامادەبوون یان بەردەوام یان شێوە و شێوازی کەسەکان، زۆر جیاواز لە هەبوونی ماددی گۆڕاو و وەرگێڕاوی جولاو لەگەڵ کات.

ئەم حاڵەتە دەروونییەی کاتێك هەست پێدەکەین لە کاتی وشیاری یان بە ئاگابوونی لە ناخەوە. ئەوەی پێی دەڵێم ئامادەبوون ( حضور ) ... کلیلێکە دەرگای ناخمان دەکاتەوە بۆ ئەوەی هەست بە هەبوونی ڕۆح بکەین. ئەو پرسیارە ئاڵۆزەی کە پێی دەڵێن ڕۆح......

بەڵگەیەکی تر لە سەر سروشتی ڕۆحی ئێمە ، ئەویش هەستکردنی خودی مرۆڤە بە هەبوونی سەربەستی ، چونکە ئەگەر ئێمە جەستەیەکی ماددی بووینایە لەناو جیهانێکی ماددی و یاساکانی زۆرەملێ بەسەرماندا بچەسپایە ، لەو کاتە هەستی سەربەستی خودی مرۆڤ هیچ مانایەکی نەدەبوو ، ئێمە ڕۆحمان هەیە لە سەرەوەی کات و مردن و یاسا زۆرە ملێ ماددییەکان دایە.

ئەی لەبارەی مردنەوە چی دەزانی ؟

هیچ کەسێك لە مردن نەگەڕاوەتەوە تا بزانین چی بەسەری هاتووە ، هەروەها ڕۆژی دوایش نەهاتووە بۆ ئەوەی بەڵگەیەکی بینراو و بەرچاو پێشکەش

بکەین. ئەوەی هەیە لەبارەی مردن تەنها ڕاستییەکی ئایینیە و عەقڵ و زانست پشتگیری دەکەن..... باشە بۆچی عەقڵ و زانست پشتگیری دەکەن؟

چونکە بەڵگەکان و دیاردەکانی ئەم هەبوونە هەموویان ئاماژە بۆ گەڕانەوەیەك دەکەن بۆ خاڵە سەرەتایەکەی ، گەڕانەوە بۆ هەمان دۆخی جاران، سەبارەت بە هەموو شتێك.... لە دوای ڕۆژ، شەو دێت ، پاشان تەواو دەبێت، دووبارە ڕۆژ دەگەڕێتەوە.... ڕۆژ ئاوا دەبێت پاشان هەڵدێتەوە و.... بەهار و هاوین و پاییز و زستان بە بەردەوامی لەناو دەچن و نوێ دەبنەوە.... مرۆڤ بە ئاگایە پاشان شەو دێت و بۆ ماوەیەك دەخەوێت. پاشان هەڵدەستێتەوە لە ڕۆژێکی نوێدا....... ئەم دیاردانە ئەوە دەگەیەنێت کە لەپاش مردن زیندوو بوون و بە ئاگابوونێك هەیە. چونکە هەموو شت دەگەڕێتەوە ، خودای گەورەش لە قورئاندا ناوی خۆی ناوە بە (دەستپێکەر، گەڕێنەوەر)، هەروەها دەفەرموویێت:﴿ ....كَمَا بَدَأَكُمْ تَعُودُونَ ﴾ الاعـراف(٢٩). واتە: (چونکە هەر چۆن دروستی کردوون لە سەرەتاوە، لە ئاییندەشدا هەر بۆ لای ئەو دەگەڕێنەوە).

باشە هەموو شتێك لەم گەردوونە ، لە گەردیلە کەکەشان (کۆمەڵە ئەستێرەکان) ، هەتا شارستانیەتەکان هەر هەموویان سوڕان و گەڕانەوەیان هەیە ، مێژووش گەڕانەوەی هەیە.

دووەم بەڵگە لەسەر زیندووبوونەوە ئەو یاسا توند و تۆڵ و جوانەیە کە هەموو شتێك گەردیلە ، کۆمەڵە ئەستێرە گەورەکان ئەلیکترۆنە نەبینراوەکان، ئەم یاسایە بەسەر هەموویاندا زاڵە و زۆر بە ڕێکوپێکی بەڕێوەیان دەبات و ملکەچن بۆی... ئەلیکترۆن ناتوانێت لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر بجوولێت

ئەگەر هێزێکی پێ نەدرێت بەگوێرەی جوولەکەی وەکو ئەو کەسەیە کە لە شەمەندەفەرێك سوار دەبێت، ناتوانێت بۆ هیچ شوێنێك بڕوات ئەگەر پلێتی پێنەبێت.. باشە ئەی بۆ ئەم سیستەمە وردە چی دەڵێی ؟!

پیاو کوژێك یان ستەمکارێك خۆی بزر دەکات، چونکە کارێکی خراپی ئەنجامداوە، ئێمە بە عەقڵ دەڵێین دەبێت ئەم پیاوە سزا بدرێت ، ناکرێت سزا نەدرێت. دەبێت جیهانێکی تر هەبێت تیایدا بە سزای خۆی بگات ، چونکە دادپەروەری وا دەڵێت......

ئێمە وا ڕاهاتووین، دەبێت دادپەروەری جێبەجێ بکرێت ، حەزمان لە دادپەروەرییە ، بە دوای دادپەروەریدا دەگەڕێین ، هەوڵدەدەین دادپەروەری بچەسپێت.... بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دادپەروەری لە دونیادا نییە.

هەروەکو چۆن خاوەن هۆش و بیرەکان دەڵێن تینووبوون بەڵگەیە لەسەر هەبوونی ئاو ، بە هەمان شێوە هەوڵدان بۆ چەسپاندنی دادپەروەری بەڵگەیە لەسەر هەبوونی دادپەروەری.... ئەگەر لەم دونیایەش بوونی نەبێت ، دەبێت کاتێك هەبێت دادپەروری بەرقرار بێت و لێپێچینەوە لەگەڵ زۆرداران و ستەمکاران بکرێت.... ئەمانە هەموویان نیشانەن ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە دەبێت زیندوو بوونەوە هەبێت ، جیهانێکی تر لێپێچینەوەی تێدا هەبێت.

مرۆڤی بڕوادار قورئان بە ڕاست دەزانێت بەبێ ئەوەی پەنا بۆ ئەم جۆرە پرسیارانە ببات. چونکە ئەو بە دڵ بڕوای هێناوە و خۆی لەم بەزمەیە ڕزگار کردووە.

ئەوەندە ماوە پرسیار بکەین و بڵێین ڕۆح چیە ؟! خودای گەورە دەفەرموێت:

﴿ وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلرُّوحِ قُلِ ٱلرُّوحُ مِنْ أَمْرِ رَبِّى وَمَآ أُوتِيتُم مِّنَ ٱلْعِلْمِ إِلَّا قَلِيلًا ﴾

الإسراء(٨٥). واته: (پرسیارت لێدەکەن لە بارەی ڕۆح ( کە چیە و چۆنە؟) بڵێ: ڕۆح بەشێکە لە فەرمانی پەروەردگارم و بە دەست ئەوە ( من نازانم چیە و چۆنە) و هیچتان پێنەبەخشراوە لە عیلم و زانست تەنها شتێکی کەم نەبێت ).

کەواتە ڕۆح پرسیارێکی قورسە، نهێنیەکە کەس هیچ لە بارەیەوە نازانێت . مایەی سەرنج و تێڕامانە هەر کاتێك لە قورئاندا ناوی ڕۆح هاتبێت ، وشەی ( من أمر ربي )و (من أمرنا ) و ( من كل أمر ) هاتووە، بۆ نموونە:

﴿ رَفِيعُ ٱلدَّرَجَٰتِ ذُو ٱلۡعَرۡشِ يُلۡقِي ٱلرُّوحَ مِنۡ أَمۡرِهِۦ عَلَىٰ مَن يَشَآءُ مِنۡ عِبَادِهِۦ لِيُنذِرَ يَوۡمَ ٱلتَّلَاقِ ﴾ غافر(١٥). واته: (ئەو پەروەردگارە پلە و پایەی زۆر بڵندە، خاوەنی تەختی فەرمانڕەوایی تایبەتی خۆیەتی، ئەو زاتە وەحی و نیگا بە فەرمانی خۆی دەنێرێت بۆ هەر کام لە بەندەکانی کە بیەوێت، بۆ ئەوەی خەڵکی بترسێنێت لە ڕۆژی بەیەکگەیشتنەوە).

﴿ يُنَزِّلُ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةَ بِٱلرُّوحِ مِنۡ أَمۡرِهِۦ عَلَىٰ مَن يَشَآءُ مِنۡ عِبَادِهِۦٓ ﴾ النحل(٢). واته: (پەروەزدگار خۆی فریشتەکان بە ڕەحمەت و ژیانەوە دەنرێرێت بۆ هەر کەسێك بیەوێت لە بەندەکانی ( کە پێغەمبەرەکانن)) .

﴿ تَنَزَّلُ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ وَٱلرُّوحُ فِيهَا بِإِذۡنِ رَبِّهِم مِّن كُلِّ أَمۡرٍ ﴾ القدر(٤). واته: (لەو شەوەدا کە جوبرەئیلیشیان لەگەڵدایە، دادەبەزن لەسەر ڕووخسەت و مۆڵەتی پەروەردگاریان، بە جۆرەها فرمان و کار).

﴿ وَكَذَٰلِكَ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ رُوحًا مِّنْ أَمْرِنَا ... ﴾ الشورى(٥٢). واته : ( ئەی محەمەد ( صلی الله علیه و سلم) ئا بەو شێوەیەی وتمان ئێمە قورئانمان بۆ رەوانە کردیت لە لایەن خۆمانەوە..).

بەم شێوەیە وشەی رۆح لەگەڵ زۆر شت بەکارهاتووە... ئایا دەکرێت فەرمانی خودا رۆح بێت؟ ئایا دەکرێت وشەی خودا رۆح بێت؟ باشە خودای گەورە بە عیسا پێغەمبەریش نەگوتووە رۆح ؟ ﴿ إِذْ قَالَتِ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ يَٰمَرْيَمُ إِنَّ ٱللَّهَ يُبَشِّرُكِ بِكَلِمَةٍ مِّنْهُ ٱسْمُهُ ٱلْمَسِيحُ عِيسَى ٱبْنُ مَرْيَمَ وَجِيهًا فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْءَاخِرَةِ وَمِنَ ٱلْمُقَرَّبِينَ ﴾ آل عمران(٤٥).. واته: (کاتێك فریشتەیەك بە مەریەمی وت: ئەی مەریەم بە راستی خوا مژدەت دەداتێ: بە وشەیەکی خۆی ( کە فرمانی ـ کن فیکون ـ ە، رۆڵەیەکت پێ ببەخشێت) کە ناوی مەسیحە، عیسای کوری مەریەمە، کە پیاو ماقووڵ و پایە بەرزە لەم دنیادا، لە قیامەتیشدا لە دەستەی نزیکانە) . وە دەفەرمووێت:﴿ ....ٱللَّهِ وَكَلِمَتُهُۥٓ أَلْقَىٰهَآ إِلَىٰ مَرْيَمَ وَرُوحٌ مِّنْهُ ... ﴾ النساء (١٧١). واته:(لە دایك بوونەکەی بە فەرمانی خوا بووە کە لە مەریەمدا ( بەرجەستە بوو) عیسا رۆح و گیانێکی ( تایبەتیە) لە لایەن خواوە بەخشراوە ).

....وشە.... فەرمان.... رۆح.... ئایا ئەمانە چەند وشەیەکن هەمان مانایان هەیە ؟ ..... ئەمانە تەنها نیشانەن...کەس ناتوانێت ماناکەیان بزانێت تەنها خودای زانا نەبێت.

لەبارەی پرسیارەکەت سەبارەت بە ئامادەکردنی رۆحەکان یان پەیوەندیکردن بە رۆحەکانەوە، لای ئێمە ئەمە کارێکە گومانی پێدەبەین... گومانی تێدایە

کاتێك دەڵێین دیاردەکانی ژوورێکی تاریك هۆکارەکەی ئامادەبوونی ڕۆحی فلان کەسە.

فەیلەسوفێکی گەورەی وەکو ( هنری سودر ) دەڵێت:" ئەم دیاردانە سەرچاوەکەی عەقڵی ناوەوەیە بۆ ئەو کەسەی کە بەم کارە هەڵدەستێت (الوسیط ) یان هێزەکانی ڕۆحە بۆ ئەم کەسە...... هیچ ڕۆحێك لە ڕاستیدا ئامادە نابێت".

هزرڤانە هندییەکان دەڵێن:" ئەوەی خۆی پیشانی ئامادەکاری ڕۆحەکان ( الوسیط ) دەدات لە کاتی ئامادەکردنی ڕۆحەکان. هەندێك ڕۆحی ژێر زەوین ، هەندێك شت دەزانن لەبارەی مردووەکانەوە ، ئەم زانیاریانە بەکاردێنن بۆ گاڵتە کردن و پێکەنین بە عەقڵی ئەو کەسانەی کە باوەڕیان پێی هەیە.

هەندێك لە سۆفیەکانیش دەڵێن: ئەوەی لەم زانستانە ئامادە دەبن ڕۆحەکان نین، بەڵکو هاوڕێیەکانن لە جنۆکەکان ، ئەوانەی کە لەگەڵ مردووەکان ژیاون لە دونیا ، بەپێی ئەم هاوڕێیەتییە هەندێك لە نهێنیەکانی مردووەکان دەزانن. جنۆکەش تەمەنیان درێژە لە پاش مردنی هاوڕێکەی هەر زیندووە .... ئەم جنۆکەیە لە دانیشتنەکان ئامادە دەبێت و نهێنیەکانی هاوڕێ مردووەکەی ئاشکرا دەکات وەکو دەنگ و سیفەت و کردارەکانی بۆ ئەوەی گاڵتە بە ئامادەبوان بکات هەروەکو چۆن هەردەم جنۆکە گاڵتە بە مرۆڤەکان دەکات.

هەروەها دەڵێن: کاتێك زەنگی دەرگا لێ دەدرێت هەر خزمەتکارە دەرگا دەکاتەوە نەوەك خاوەن ماڵەکە، بەڵکو جیهانی خۆیان بەجێ ناهێڵن........

ئەوەی کە ئامادە دەبێت و ئامادەبوان هەڵدەخەڵەتێنێت جنۆکە و ڕۆحە ژێر زەویەکانن. ڕۆحی مرۆڤەکان هەر لە جیهانی ڕۆحەکان دەمێننەوە و ناکرێت ئامادە ببن.

لە هەندێك ئەو ئامادەکاریانەی بۆ ڕۆحەکان کە ئێمە ئامادەی بووین هەندێك زانیاریمان بە دەستکەوتووە لەسەر ئەم بابەتە و دەڵێین: هیچ بەڵگەیەك نییە کە بسەلێنێت ئەم دیاردانەی لە ژوورێکی تاریکدا بەدەردەکەون هۆکارەکەی ئامادەبوونی ڕۆحەکانە. بەڵکو دەڵێین ڕای سۆفییە موسڵمانەکان زیاتر نزیکە بۆ قەبووڵکردن ، لەگەڵ ئەوەشدا هێشتا ئەم بابەتە لە ژێر لێکۆڵینەوەدایە . هەروەها زۆر بە داخەوە لەم بابەتەدا شتی پڕوپووچ و بێ مانا زیاترە لە ڕاستییەکان ، هیچ کاتێك ڕاستی نەگوتراوە..... گومانیش تێدا نییە تۆ پێدەکەنی چونکە ئەم ناوانە جنۆکە ، ڕۆحە ژێر زەوییەکان ، هاوڕێ ، بەلای تۆوە شتی نامۆن....... تۆش هەقی خۆتە بڕوا نەهێنی. چونکە ئەگەر تۆ بڕوات بە ڕۆحی خۆت نەبێت چۆن دەکرێ بڕوا بە جنۆکەی من بهێنی.......

ئەگەر تۆ بڕوات بە خودا نەبێت چۆن بڕوات بە جنۆکەکانی ئەو دەبێت ، لەگەڵ ئەوەشدا ئەگەر تۆ لە پێش (١٠٠) ساڵ لەمەو بەر لە دایك بوویتایە و ، کەسێك بهاتایە لات و پێتی بگوتبایە تیشکێك دەرکەوتووە، ئاسن کۆن دەکات یان وێنە لە هەوادا بڵاودەبنەوە ، زەریاکان کەمتر لە چرکەیەك دەبڕن ، مرۆڤ چووە سەر مانگ ، بە دڵنیاییەوە تۆ پێدەکەنیت دەهات و دەنگت بەرز دەبووە دەتگوت ئەم پیاوە لە نەخۆشخانەی شێتەکان دەرچووە و لە خۆیەوە وڕێنە دەکات . بەڵام ئێستا ئەم ڕووداوانە بوونەتە ڕاستییەکی حاشاهەڵنەگر، لەبەر چاو و لەسەر گوێمان.

# بـــــەشی نۆیەم

## - ویـــــژدان ( الضمير )

هاوڕێیەکـەم گـوتی: ئێـوە زۆر بـە پـیرۆزی باسـی ویـژدان دەکـەن ، هـەروەکو شـتێکی پـیرۆز و باڵادەسـت ، لەگـەڵ ئـەوەش ویـژدان دروسـتکراوێکی کۆمەڵایەتییە ، پارمیەکە لە ماددەی سفر دروستکراوە و بۆیـە کـراوە و قالب دراوە لـە تـەنووری هەڵـسوکەوتە کۆمەڵایەتییـەکان ، ویـژدان لای ئێمـە گۆڕانکاری بەسـەردا دێـت و شێواز و مەرجـەکانی بـەپێی بەرژەوەنـدی کـاتی دەگۆڕێـت. ئەگـەر نرخێکی باشـی هـەبوو دەڵێین باشـە، خـراپ بـوو دەڵێین خراپـە، هـەتا ئەگـەر نرخـەی ئـەو داوێـن پاکییـە بێـت کـە وەکـو چـاوتان دەیپارێزن؟.

زۆر بە هێواشی وەڵاممـداوە و گوتم: بـەڵێ.... ئەمـە ڕای فەلسەفەی ماددییـە، بـەپێی ئـەوەی کـە گوێمـان لێبـووە.. ویـژدان دەسـەڵاتە ، ئاگـادارت دەکاتـەوە و

ڕێگریت لێ دەکات، بە هەندێك هۆکاری کۆمەڵایەتی پەیدا بووە ، تەنها کۆمەڵێك زانیاری بە دەست هاتووە ، لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر، لەسەر دەمێکەوە بۆ سەردەمێکی تر ، لە نەتەوەیەکەوە بۆ نەتەوەیەکی تر دەگۆڕێت.... ئەمە قسەی ئێوەی زانا ماددییەکانە..... بەڵام ڕاستی شتێکی ترە بێجگە لەمە ، لە ڕاستیدا ویژدان ڕووناکییەکی خوداییە لە بنەڕەتدا لە مرۆڤدا دروستکراوە ، نیشانە و بەڵگەیەکە مرۆڤ لەگەڵیدا لە دایك بووە.... ڕێنیشاندەری ڕاستییەکانە ، لەگەڵ هەموو ڕەهەندە بەدەستهاتووە کۆمەڵایەتییەکان. ویژدان خاوێنکەرەوەی هەموو پێوەرە کۆمەڵایەتی و مرۆڤایەتییەکانە..... زۆر بەڵگە هەن پشتگیری ئەم ڕاستیە دەکەن و ڕاو بۆچوونتان ڕەتدەکەنەوە.

تەماشای جیهانی گیانەوەران بکە هیچ کۆمەڵگایەکیان نییە، بە واتای کۆمەڵگای مرۆڤەکان — دەبینین پشیلە پیسایی دەکات پاشان پیسایەکەی بە خۆڵ دادەپۆشێت ، لە چ کۆمەڵگایەك ئەم پشیلەیە فێری ئەم کار و ڕەوشتە بووە ؟! چۆن دەتوانێت جیاوازی بکات لە نێوان پیسایی و خاوێنی ؟!

هەروەها کاتێك پشیلە ماسییەك دەدزێت ، مرۆڤ دەیگرێت و لێی دەدات لەو کاتە سەر و چاوی نزم دەکات زۆر بە ئاشکرایی دەبینین هەست بە تاوان دەکات.... دەبینین لەگەڵ منداڵان یاری دەکات لە ماڵەوە، کاتێك شتێك دەشکێنێت ، غار دەدات خۆی لە شوێنێك دەشارێتەوە و دەزانێت هەڵەیەکی کردووە...... ئەمانە هەموویان نیشانە و ئاماژەن لەسەر هەبوونی ویژدان، چونکە لە جیهانی پشیلەکان هیچ هۆکار و پاڵنەرێك نییە بۆ دروستبوونی ئەم هەستانە...... بەڵکو هیچ کۆمەڵگایەکی پشیلەیی لە بنەڕەتدا نییە.

هەروەها خۆشەویستی نێر و مێ لە کۆترەکان بۆ یەکتری..... وەفاداری ئەسپ بۆ خاوەنەکەی و مانەوەی لەگەڵیدا تا مردن..... گەورەیی و دادپەروەری شێر کاتێك نایەوێت لە پشتەوە هێرش بکاتە سەر نێچیرەکەی....... شەرمی حوشتر لەگەڵ مێینەکەی جووت نابێت ئەگەر بزانێت کەسێك هەیە چاودێری دەکات. هەروەها ئەو ڕووداوە ڕاستەقینەی کە لە یاری سێرك ڕوویدا لە قاهیرە کاتێك شێرێك لە پشتەوە پەلاماری خاوەنەکەیدا کە ناوی ( محمد الحلو ) بوو، زۆر بە سەختی بریندااری کرد ، پاشان کە چۆن فەرمانبەرانی سێرك دەگێڕنەوە ئەم شێرە لە خواردن مانی گرت و خۆی زیندانی کرد و نەدەهاتە دەرەوە...... دوای بردیان بۆ باخچەی گیانلەبەران و مێینەیەکی شێر بردیانە لای بۆ ئەوەی لەم خەمە ڕزگاری ببێت ، بەڵام دەری کرد نەیهێشت لە لای بمێنێتەوە....... بەردەوام بوو لە ڕەتکردنەوەی خواردن ، تا گەیشتە ئەو ڕادەیە بە ددان ئەو دەستەی خۆی دادڕاندن کە خاوەنەکەی پێ کوشتووە . بووە هۆی خوێنبەربوونێکی زۆر لە دوایدا گیانی لە دەستدا...... گیانەوەرێك زۆر پەشیمان دەبێتەوە بۆ ئەوەی لە تاوانەکەی ڕزگاری بێت خۆی دەکوژێت....... لە چ کۆمەڵگایەکی جیهانی ئاژەڵی کوشندەدا ئەم شێرە فێری ئەم ڕەوشتە بووە ؟! ئایا لەم جۆرە کۆمەڵگا ئاژەڵیانە یاسایەك هەیە کە بڵێت ئەو ئاژەڵەی مرۆڤ دەکوژێت دەبێت خۆی بکوژێت ؟!...... ئێمە لێرەدا لە بەرامبەر خۆڕەوشت و چاکە و ویژدانێکین کە لە کۆمەڵگای مرۆڤایەتیدا بوونی نییە. ئەمە بەڵگەن لەسەر سەرنەکەوتنی بیری ماددی بۆ پێناسە و ناسینی ویژدان...... کەواتە تەنها ئایین پێناسە و ناسینی ویژدان دەکات ، کە دەڵێت ویژدان ڕووناکییەکی خوداییە لە ناخی مرۆڤدا ، هەروەها هەموو

ڕەهەندە کۆمەلایەتییە بەدەستهاتووەکان ئەم ویژدانە ڕۆشەن دەکەن و ئەم ڕووناکییە بەدەر دەکەوێت....... هەر ئەمەبوو کە لە نێوان شێر و خاوەنەکەیدا ڕوویدا ، پێکەوە ژیان و خۆشەویستی و برادەرایەتی ئەم هەستە ئاژەڵییەی لابرد و ئەم ڕووناکییە بەدەرکەوت...... لەبەرئەوە شێرەکە دڵگران و پەشیمان بووە ، ئەمە هۆکارێك بوو بۆ ئەوەی وەکو مرۆڤەکان خۆی بکوژێت...... لەبەر ئەمەش پێغەمبەرمان دەفەرمووێت:(( الحلال بين والحرام بين .....)) واتە:(شتی حەڵاڵ دیارە و شتی حەرامیش دیارە....) وە دەفەرمووێت: (( إستفتِ قلبك وإن أفتاك الناس )) واتە: (بگەڕێوە بۆ دڵ و دەروونت رایان وەربگرە، هەرچەندە خەڵکیش یارمەتی دەر و ڕێ پیشاندەر بن).

بەم شێوەیە ئێمە پێویستمان بە کولێژی شەریعە نییە بۆ ئەوەی هەڵە و ڕاستییەکان ، هەق و ناهەق ، حەڵاڵ و حەرام بۆمان دیار بکات.چونکە خودای گەورە لە ناو دڵ و دەروونی هەمووومان کولێژێکی شەریعەی داناوە ، پێوەرێکە بە هیچ شێوەیەك هەڵە ناکات ، بەهۆی ئەم پێوەرە ئەو شتانەی کە لێمان داواکراوە دەکەین و هەموو شتە ماددییەکان و ئارەزووەکان لێك جیا دەکەینەوە هەر بەم پێوەرەشە شتەکان بە دڵ و چاو دەبینین. شتەکان دەزانین و لێکیا جیادەکەینەوە . بەبێ ئەوەی پەنا بۆ زانیارییە کۆمەڵایەتیەکان ببەین، کە ئەویش ڕووناکی خودایە بەناوی ویژدان . خودای گەورە دەفەرمووێت:﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِن تَتَّقُوا۟ ٱللَّهَ يَجْعَل لَّكُمْ فُرْقَانًا وَيُكَفِّرْ عَنكُمْ سَيِّـَٔاتِكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ۗ وَٱللَّهُ ذُو ٱلْفَضْلِ ٱلْعَظِيمِ ﴾ الانفال(٢٩).

واتـە: (ئـەی ئـەو کەسـانەی باوەڕتـان هێنـاوە، ئەگـەر تـەقوای خـوا بکـەن و پارێزکـاری بکـەن، ئـەوە خـوا بەرچـاو ڕۆشـنییەکی تـەواوتان بـۆ فەراهـەم دەهێنێت، هەروەها هەڵە و گوناهەکانیشتان دادەپۆشێت و لێتان خۆش دەبێت، چونکە خوا خاوەنی فەزڵ و ڕێزی گەورە و بێ سنوورە).

کەواتە ویژدان ڕاستییەکی جێگیرە ، هەروەها ڕەوشـتە بنەڕەتیـە بـەرزەکانیش جێگیرن ، هەر بۆیە کوشـتنی پیـاوێکی بـێ تـاوان هـیچ کاتێـك نابێتـە کـارێکی چـاك و ڕەوا . هـەروەها دزی ، درۆ ، ئـازاردانی خـەڵك ، کـاری خـراپ ، زمـان پیسی ، توندوتیژی ، دووڕوویی ، ناپاکی .... ئەمانە هەمویان بەدڕەوشـتین ... هەر بە بەدڕەوشتی دەمێننەوە تا ڕۆژی کۆتایی.

هـەر بـەم شـێوەیە خۆشەویـستی ، بـەزەیی ، ڕاسـتگۆیی ، نـەرم و نیـانی ، لێخۆشبوون ، چاکە ، هـەر هـەموویان بەخـشش و ڕەوشت بـەرزین... بـە هـیچ شێوەیەك نابنـە تـاوان، تـەنها لـەو کاتـە نـەبێت کاتێـك ئاسمانـەکان نـەمێنن ، شێتایەتی بەرقرار بێت ، عەقڵ نەمێنێت ؟!!

# بـــــــەشی دەیەم

## - ئـــايـــا ئەرکەکانی حەج بت پەرستییە ؟!

هاوڕێیەکەم پەنجەکانی هەردوو دەستی لێك دەسووڕاندن و زەردەخەنەیەکی ناشیرینی بە دەم وچاویەوە دیار بوو، تا ددانەکانی لەگەڵ دیاربوون و چاوەکانی دەبریسکانەوە و گوتی: ئایا تۆ تێبینی ئەومت نەکردووە کە ئەرکەکانی حەج لای ئێوە بت پەرستییەکی زەقە ؟ خانووە ڕەشەکە، کە ئێوە پێی دەڵێن ( کەعبە )، دەستی خۆتانی لێدەدەن و لە دەوریدا دەسووڕێنەوە...... بەرد بارانکردنی شەیتان..... ڕاکردن لە نێوان سەفا و مەروادا...... ماچکردنی بەردی ڕەش........ حەوت جار دەسووڕێنەوە ، حەوت جار بەرد هاوێشتن...... حەوت جار دەسووڕێنەوە ، ئەوانەی هەموویان پاشماوەی قسە پڕوپووچە کۆنەکانن، لەبارەی کاریگەری جادووی ژمارە حەوت....... جل و بەرگی ئیحرام....... لێم ببورە ئەگەر بەم قسانە ئازاری تۆم دابێت ، بەڵام زانست شەرم نازانێت ، من ناچارم بە ڕوونی و ئاشکرایی

ئەم جۆرە پرسیارانەت لێ بکەم...... پاشان دیتم جگەرەکەی هەڵتری و لە ژێر چاویلکەکانییەوە چاودێریم دەکات، ئاخۆ چۆن وەڵامی دەدەمەوە.........

زۆر بە هێمنی گوتم:

ئایا تۆش تێبینت نەکردووە یاساکانی مادده ، ئەوانەی کە خوێندووەتەوە ، بە هەمان شێوە دەڵێن ئەوەی بچووکە لە دەوری گەورەکەدا دەسوورێتەوە. ئەلیکترۆن لە گەردیلە بە دەوری ناوکدا دەسوورێتەوە ؟ مانگ بە دەوری خۆردا ، زەوی بە دەوری رۆژدا ، رۆژ بە دەوری کەکەشان ( مجرة )دا، ئەم کەکەشان(ئەم کۆمەڵە ئەستێرە)یە بە دەوری کۆمەڵەیەکی گەورەتردا ، تا دەگەینە مەزنی رەها ؟ کە ئەویش خودایە ...... ئایا ئێمە نالێین ( الله أكبر ).... واتە گەورەتر لە هەموو شتێك.......؟

ئێستا خۆت بە دەوریدا دەسوورێی لەناو کۆمەڵەی خۆت بەبێ حەزی خۆت ، هیچ شتێك جێگیر نیە ، لەم گەردوونە ، تەنها خودا نەبێت ، کە هەموو شتێك دەسوورێنێتەوە ؟!

ئەمە یاسای گەورە و بچووکە کە تۆ لە فیزیا خوێندووەتەوە....... بەڵام ئێمە بە حەز و ویستی خۆمان بە دەوری کەعبەدا دەسوورێینەوە. کە ئەویش یەکەم ماڵی خودایە لەسەر گۆی زەوی، کە دەبێت خودا تیایدا بپەرسترێت....... لەو کاتەوە تا ئێستا بووەتە نیشانەی ماڵی خودا.

ئایا ئێوە لە ( کرملن ) بە دەوری پیاوێکی مردووی پارێزراودا ناسوورێنەوە و بە گەورە دەزانن و دەڵێن ئەو سوودێکی زۆری بۆ مرۆڤایەتی هەبوو ؟!... ئەگەر ئێوە گڵکۆی شکسپیرتان زانیبوایە پێشبڕکێتان دەکرد بۆ سەردانی ئەو، نەك سەردانی ( محەمەد ) پێغەمبەر ( دروودی خوای لە سەر بێت )؟

ئایا ئێوە گوڵ لەسەر مۆنۆمێنتێکی دروستکراودا دانانێن و دەڵێن ئەمە مۆنۆمێنتی سەربازی بزربووە ؟! باشە ئێوە بۆچی گاڵتەمان پێ دەکەن کاتێک کە بەرد دەهاوێژین و دەڵێین ئەمە دروشمی شەیتانە؟!

ئایا تۆ بە بەردەوام لە غاردانا نیت لە رۆژی لەدایک بوونت تا رۆژی مردنت ، پاشان کورت دێت سەر لە نوێ هەمان قۆناغ و دروشم ئەنجام دەدات؟... کە سەفا یان بۆشایی یان بەتاڵ، کە نیشانەیە بۆ نەبوون ( عدم )، بۆ مەروە ، واتە ئەو کانییە ئاوەی کە نیشانەی ژیان و هەبوونە ؟!.. لە نەبوونەوە بۆ هەبوون ، پاشان لە هەبوونەوە بۆ نەبوون ، ئایا ئەمە ئەو جووڵە پەتە نییە کە هەموو زیندەوەرانی لەسەرن ؟!.

ئایا بە ڕای تۆ، ئەرکەکانی حەج نیشانەیەکی قوڵی کورت کراوە نییە بۆ ئەم هەموو نهێنیانە ؟..... ئەو ژمارە حەوتەی کە گاڵتەت پێدێت ..... باشە پایەکانی ئامێری موسیقا حەوت سوڵ نییە، لە دوای سوڵی حەوتەم نابێت بە هەشت، بەڵکو دەگەڕێتەوە بۆ حەوت سوڵی تر ، هەتا دوایی ....؟!. ڕەنگەکانی تیشکی رووناکی حەوتن..... ئەلیکترۆنەکان بە دەوری ناوکدا دەسووڕێن بە حەوت بازنەیی ....... کۆرپەلە تەواو نابێت لەناو سکی دایکی تا مانگی حەوتەم ، ئەگەر لە پێش ئەم کاتە لە دایک ببێت دەمرێت....... رۆژەکانی هەفتە لای ئێمە و لای هەموو کەسێك حەوت رۆژن، بەبێ ئەوەی مرۆڤەکانی دابنیشن و لەسەری رێك بکەون...؟.. ئایا ئەمە ئاماژە بۆ هیچ شتێك ناکات، یان ئەم زانستانە هەموویان قسەی بێ مانا و جادوون؟!

ئایا تۆ بت پەرست دەبی کاتێك هەندێك لە هەڵەکانی خۆشەویستەکەت قەبووڵ دەکەی ؟ بۆچی گلەییمان لێ دەکەی کاتێك ئێمە بەردە ڕەشەکە ماچ

دەکەین ، ئەو بەردەی کە پێغەمبەرمان محەمەد (دروودی خودای لەسەر بێت) هەڵی گرتووە و ماچیشی کردووە؟ . هیچ بت پەرستییەك لێرەدا نییە ، ....
چونکە ئێمە کاتێك بەردە ڕەشەکە ماچ دەکەین یان ئەرکەکانی حەج جێبەجێ دەکەین ، عیبادەتمان بۆ بەردە ڕەشەکە نییە، بەڵکو بۆ ئەو هەموو مانا و نیشانە فووڵانەیە کە لەگەڵ بیرهاتنەکان لە خۆی دەگرێت.

ئەرکەکانی حەج چەند بۆنەیەکن ، بۆ جووڵاندن و زیندووکردنەوەی سۆز و بەهێزکردنی لایەنی خودا پەرستی لە دڵ و دەروونەکاندا....

لەبارەی ئەو جل و بەرگەی لە حەج لەبەر دەکەین و بەو مەرجەی درووماانی تێدا نەبێت ، ئەمە نیشانەیە بۆ دەرچوون و گرنگی نەدان بە جوانی دونیا ، لەگەڵ ئامادەبوونی تەواو لەبەردەم خودای دروستکەر...... هەروەکو چۆن بە پارچە پەڕوویەك دێینە دونیا ، بە پارچە پەڕوویەکیش دەڕۆین و بە پارچەیەك دەچینە ناو گۆڕ..... ئایا ئێوە مەرج دروست ناکەن کاتێك دەچن بۆ لای پاشایەك یان سەرکردەیەك کە جلوبەرگی جوان و گرانبەها لەبەر بکەن؟ ، لە بەرامبەردا ئێمە دەڵێین: هیچ شتێك لەوە ڕێکتر و جوانتر نییە کاتێك دەچیتە لای پەروەدگاری گەورە. هەموو جوانی دونیا لەلایەك دابنێی. چونکە خودای پەروەردگار لە هەموو پاشایەك گەورەترە ، وە هیچ لەوە گونجاو تر نییە کە بەبێ جلوبەرگ و لەخۆبایی بوونێکی تەواو لەبەردەم گەورەیی ئەودا. چونکە ئەم جلوبەرگە سادەیە ، هەموو کەسێك لەبەر دەکات ، هەژار و دەوڵەمەند و پیاوە گەورەکان و بێ دەسەڵاتەکان ، ئەمە مانای ئەوە دەدات کە هەموویان برای یەکترن، هەرچەندە لە ڕووی سەروەت و سامان و پلە و پایە لە یەکتر جیاوازیش بن.

لای ئێمە حەج کۆبوونەوەیەکی گەورەیە، هەروەها کۆنگرەیەکی ساڵانەیە. هەروەها نوێژی هەینی ، کە ئەویش کۆنگرەیەکی هەفتانەی بچووکە ، ئەمانە هەموویان کرداری جوان و پڕ مانای جوانن، بۆ ئەو کەسەی کە بیر دەکاتەوە..... ئەم کارانە زۆر دوورن لە بت پەرستییەوە....

ئەگەر تۆش لەگەڵ ملیۆنەها کەس لە عەرەفات ڕابوەستی ، ئەوانەی کە دەڵێن ( الله أكبر ) و قورئان دەخوێنن و دەپاڕێنەوە و بە هەزارەها زمان و دەڵێن ( لبيك اللهم لبيك ) هەروەها لە پێناو خۆشەویستی خودا دەگرییێن ، ئەتۆش دەگریای و لەگەڵیان دەتوایتەوە و هەست بە بوونی خۆت نەدەکرد، بەڵکو هەستت بە توانەوە دەکرد و دەپاڕانەوەیتەوە لە خودا گەورەیەیی کە هەموو شتێکی بەدەستە.

# بەشی یازدەهەم

## - بۆچی ناکرێت قورئان لە نووسینی ( محەمەد ) بێت ؟

هاوڕێیەکەم گوتی: من نامەوێت هەستت بریندار بکەم، چونکە من دەزانم قورئان لای تۆ چەند گەورە و پیرۆزە و شانازی پێوە دەکەی ، هەروەها من لەگەڵ تۆم کە قورئان کتێبێکی زۆر گەورەیە...... بەڵام بۆچی ناکرێت لە نووسین و دانانی ( محەمەد ) بێت ؟ ، پیاوێك بەم گەورەیە شتێکی نامۆ نابێت ئەگەر کتێبێك دابنێت لە گەورەیی قورئاندا بێت، بەڵکو زۆر شیاوتریش دەبێت لەوەی کە بڵێین خودای گەورە لە ئاسمانەوە هێناویەتە خوارەوە؟ کاتێك ئێمە نەماندیتبێت خودا شتێك لە ئاسمانەوە هێنابێتە خوارەوە ، چۆن دەتوانین لەم سەردەمە بڕوا بۆ کەسێك دروست بکەین ، کە فریشتەیەك هەیە بەناوی (جبریل)ەوە لە ئاسمانەوە دێتە خوارێ، سروش بۆ هەندێك بەندە دێنێت ؟!!

به هێمنی گوتم: بەڵکو ئێمە لە سەردەمێکین زۆر بە ئاسانی و بە تەواوی باوەڕ بکەین کە فریشتە هەن و نابینرێن ، هەروەها دەکرێ ڕاستییەکان بگەیەنرێنە مرۆڤ بە هۆی سروشەوە....... چونکە ئەمڕۆ باسی ئەوە دەکرێت شت بینراوە لە ئاسمان دەفڕێت و دێتە سەر زەوی . ئەستێرەی دوور ، تیشکی نەبینراو کە دەتوانێت شت بکوژێت ، شەپۆڵە بێ تەلەکان ، کە دەتوانن ئامانجەکان دیاری بکەن و لەناو ببەن ، وێنە دەگوزرێت بۆ لەرە لەر لە هەوادا، پاشان شتێك پێشوازی دەکات و وەردەگرێت ، کامێرا هەیە وێنەی سێبەرەکان یان شتی نەبینراو ( أشباح )دەگرێت ، چاوەکان دەتوانن لە تاریکیدا ببینن ، پیاو لەسەر مانگە ، کەشتییەك چووە سەر مەریخ...... ئەوانە ئێستا هەموو شتی نامۆ نین..... کەواتە نامۆ نابێت کاتێك گوێمان لێبێت بڵێین خودا فریشتەیەکی بە نهێنی بۆ کەسێك ناردووە ؟ بەهۆی ئەم فریشتەوە سروشی بۆ پێغەمبەران ناردووە ،.. ئێستا لەم سەردەمە هەبوونی جبریل و هاتنە خوارەوەی بووە بە ڕاستیەکی پلە دوو..... بەڵکو ئەمڕۆ زۆر شتی لە ئەو نامۆتر دەبیستین.

کاتێك ئێمە دەڵێین قورئان لە نووسینی محەمەد ( دروودی خودای لەسەر بێت) نییە ، چونکە قورئان بە شێواز و مانا و وشە و پیتەکان لەگەڵ ئەو زانستانەی لە خۆ دەگرێت . نهێنی و جوانی و ڕەوانبێژی و زمانەوانی و شتە وردەکانی ناکرێت لە توانای مرۆڤدا بێت بتوانێت ئەم شتانە بەم شێوازە ڕێکبخات و بنووسێت ، لەگەڵ ئەوەشدا محەمەد (دروودی خودای لەسەر بێت) نەخوێندەوار بوو ، خوێندن و نووسینی نەبوو ، لە هیچ قوتابخانەیەك فێر نەبووە ، لەگەڵ هیچ شارستانیەتێك تێکەڵ نەبووە ، لە دورگەی عەرەبی

دەرنەچـووە . کەواتـە گومـان بـردن یـان پرسـیارکردن لـەم ڕووداوە شـتێکی ئەستەمە....... خودای گەورە تەحەددای ئەو کەسانە دەکات کە دەڵێن محەمەد ( دروودی خودای لەسەر بێت ) ئەمەی نووسیوە، کە شتێکی وەکو ئـەو بهێـنن یـان بەشـێك وەکـو ئـەو بنووسـن....... خـودای گـەورە دەفـەرموویت:﴿ وَإِن كُنتُمْ فِي رَيْبٍ مِّمَّا نَزَّلْنَا عَلَىٰ عَبْدِنَا فَأْتُوا بِسُورَةٍ مِّن مِّثْلِهِ وَادْعُوا شُهَدَاءَكُم مِّن دُونِ اللَّهِ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ ﴾ البقرە(٢٣). واتە:(جا ئەگەر ئێوە لە دوو دڵیدان و گومانتان لەم ( قورئانە پیرۆزە) هەیە کە دامانبەزاندووە بۆ بەندەی خۆمان محەمەد ( صلی الله علیه و سلم) ئەگـەر بۆتـان دەکرێـت ئێـوەش هـەوڵ بـدەن سوورەتێکی وەك ئەو بهێنن، هاوپەیمان و هاوکارەکانیشتان جگە لە خـوا بـانگ بکەن ئەگـەر ئێـوە ڕاسـت دەکـەن) ، ئـەم تەحەددایە تـا ئێـستاش بەردەوامـە ، بەڵام کەس نەیتوانیوە شتێك بهێنێت....... کەسانێك هەندێك وشـە و ڕسـتەی دروسـتکراوی سـادەیان دروسـت کـرد و گوتیـان ئەمـە وەکـو قورئانـە . بـەڵام نەیانتوانی هەمان سورەت بە هەمان ئیعجاز و ڕەوانبێژی بهێنن.

ئەگــەر بــە ڕاشــکاوی و دادپەروەریانــە تەماشــای قورئــان بکــەین ، بۆمــان دەردەکـەوێت کـە بـە هـیچ شـێوەیەك ناکرێـت محەمــەد ( درووودی خـــودای لەسەر بێت ) دانەری بێت لەبەر ئەم هۆیانە:

یـەکەم: چونکە ئەگەر قورئان لە داهێنانی محەمەد بوایە ، هەموو نەخۆشی و بەسەرهات و ئازارەکانی لەم قورئانەدا دەنووسـییەوە، دەبیـنین لـە یـەك سـاڵدا خێزانەکەی خدیجە لەگەڵ ئەبو تـالیبی مـامی لـە دەسـتدەدات ، هیچ کەسێك نامێنێت یارمەتی بدات لەم ژیانە...... لێرەدا هەرچـەندە خـەم و پـەژارەکانی

ئەوەنـدە زۆربـوون، بـەڵام لـە قورئانـدا تـەنها بـە وشـەیەکیش باسـیان لێـوە نەکراوە، هەروەها ئیبراهیمی کوڕی دەمرێـت و بـۆی دەگرییێـت ، لـەو بارەیـەوە هـیچ شـتێك لـە قورئانـدا نـەهاتووە....... بـەم شـێوەیە قورئـان دوورە لـە خۆیەتییەکان و بابەتەکانی محەمەد (دروودی خودای لەسەر بێت ).... بەڵکو بە پێچەوانەوە ئایەتـەکانی دژی کـردەوە و بیرکردنـەوەکانی محەمـەد دەهاتنـە خوارەوە ، هەندێك جار ئایەتەکان گلەییان لە کردەوەکانی دەکرد ، بـۆ نموونـە هەڵسوکەوتی لەگەڵ (عبـدالله)ی کوڕی (أم مکتـوم) ، کە پیاوێکی کوێر بـوو. خـودای گــەورە دەفــەرموویت:﴿ عَبَسَ وَتَوَلَّىٰٓ أَن جَآءَهُ ٱلۡأَعۡمَىٰ وَمَا يُدۡرِيكَ لَعَلَّهُۥ يَزَّكَّىٰٓ ﴾ عـبس(١-٣). واتـە: (ڕووی گـرژ کـرد و ڕووی وەرگێـڕا ( مەبەسـت پێغەمبـەرە کاتێك عبدالله ی کوڕی أم مکتوم کـە نابینـا بـوو هات بـۆ خزمـەتی، ئـەویش هەندێك لە سەرانی قوڕەیشی کۆ کردبـۆوە بـە ئومێـدی هیدایـەتیان، عبـدالله وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، خوا چی فێرکردوویت منـیش فێربکـە، پێغەمبـەر ( صلى الله علیه وسلم) پێی ناخۆش بوو کە قسەکانی پـێ دەبڕێـت، لەبەرئـەوە ڕووی گرژکـرد و ڕووی وەرگێـڕا. بۆیـە سـەرەتای ئـەم سـوورەتە دابـەزی کـە گلەییە لە پێغەمبەر( صلى الله علیه وسلم). لەبەرئەوەی نابیناکە هات بۆ لای. جا تۆ چوزانیت بەڵکو ئەو هاتبێت تا دڵ و دەروونی خاوێن بکاتەوە).

هەندێك جاریش ئایەتەکان دەهاتنە خوارەوە و کردەوەکانی پێغەمبەریان ڕەت دەکردەوە. خـودای گـەورە دەفـەرموویت:﴿ مَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَن يَكُونَ لَهُۥٓ أَسۡرَىٰ حَتَّىٰ يُثۡخِنَ فِي ٱلۡأَرۡضِۚ تُرِيدُونَ عَرَضَ ٱلدُّنۡيَا وَٱللَّهُ يُرِيدُ ٱلۡأٓخِرَةَۗ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ لَّوۡلَا كِتَٰبٌ مِّنَ ٱللَّهِ سَبَقَ لَمَسَّكُمۡ فِيمَآ أَخَذۡتُمۡ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴾ الانفال(٦٧-٦٨). واتـە:

(بۆ هیچ پێغەمبەرێك نەبووە كە دیلی هەبێت، هەتا كاتێك چاك پایەدار و جێگیر دەبێت لە زەویدا، ( مەگەر) كەلوپەل و شتومەكی دنیاتان دەوێت؟! لە كاتێكدا خوا ( سەرفرازیی) ئەو جیهانی دەوێت و قیامەتی مەبەستە و خوا باڵادەست و دانایە، خۆ ئەگەر بڕیارێك لەلایەن خواوە پێش نەكەوتایە لەسەر ئەو شتانەی كە وەرتان گرت ئەوە سزایەكی زۆر گەورەتان تووش دەبوو).

هەنـدێك جـاریش قورئـان بـە محەمـەد دەفـەرمووێت كـە بـە هاوەڵـەكان، پرسیاركەران شتی ئاوا رابگەیەنێت ، ئەگەر قورئـان لـە نووسـراوی ئـەو بوایـە ئـەم شـتانەی نـەدەگوت. قورئـان دەفـەرمووێت:﴿ قُلْ مَا كُنتُ بِدْعًا مِّنَ ٱلرُّسُلِ وَمَآ أَدْرِى مَا يُفْعَلُ بِى وَلَا بِكُمْ ۖ إِنْ أَتَّبِعُ إِلَّا مَا يُوحَىٰٓ إِلَىَّ وَمَآ أَنَا۠ إِلَّا نَذِيرٌ مُّبِينٌ ﴾

الاحقاف(٩). واتە( ئەی پێغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم) پێیـان بڵـێ: كـە مـن یەكـەم پێغەمبـەر و تـازە پەیـدابوو نـیم، ناشـزانم چـیم بەسـەر دێـت، چـیش بەسـەر ئێـوە دێـت؟ مـن تـەنها شـوێنی ئـەو وەحـی و نیگایـە دەكـەوم كـە پـێم دەگات و من تەنها بێداركەرەوەیـەكی ئاشكرام )... هـیچ پێغەمبـەرێك نـەبووە هەر لە خۆیەوە بە خەڵك بڵێت من نازانم چی بەسەر من و ئێوەدا دێـت . مـن نـاتوانم خۆشـی بـۆ خـۆم بهێـنم ، ناخۆشـی لـە خـۆم دووربخەمـەوە. هـەروەها ناتوانم خۆشی بۆ ئێوە بەرجەستە بكەم و ناخۆشی لـە ئێـوە دوور بخەمـەوە . چـونكە ئەمـە كارێكـە دەبـووە هـۆی دووركەوتنـەوەی خـەڵك، هـەر ئەمـەش بەڕاستی روویدا . جووڵەكەكان ئەم قسەیان كردە بەڵگە و هاتن و گوتیان ئـەم پێغەمبەرە هیچ سوودی نییە، چونكە ناتوانێت شتێك بۆ خۆی و ئێمە بكات ، پیاوێكە پێویستمان پێی نییە ، باشە ئەگەر قورئان لە داهێنانی محەممەد بێت؛

دەكرا ئەم جۆرە قسانە لە قورئانـدا بنووسـرێت ؟! قسەیەك كە ببێتـە هۆی دووركەوتنەوەی خەڵك؟!.

دووەم: ئەگەر ئێمە سەیری دەستەواژەكانی قورئان بكەین ، دەبینـین كـە شـتی نوێن لە هەموو ڕوویەكەوە ، لە مانا و پێكهاتە و ڕیزبەندی و ئاوێتەبوون ، لە ئەدەبی عەرەبی پێش قورئـان نووسـینی بـەم شێوازە نـەبووە ، هـەروەها دوای قورئـانیش نەنووسـراوە ، تـا گەیشتە ئـەو ڕادەیـە كـە بڵێین دەتـوانین زمـانی عەرەبی دابـەش بكـەین بـۆ سێ بـەش: هـۆنراوە ، پەخشان ، قورئـان. چونكە ئێمە لە بەرامبەر نووسراوێكین بەشێوەیەكی تایبەت چێنراوە، نە بە هـۆنراوە دەچێت، نە بە پەخشان، چونكە مۆسیقا و ئـاوازی هـۆنراوە بەنـدە بـە وەزن و قافیەوە ، بەڵام وەزن و قافیەی قورئان ئاواز و موسیقاكەی ناوەكییـە ، ئـاواز و مۆسـیقایەكی تایبەتـە. بـۆ نموونـە كاتێك كـە دەڵێین:﴿ وَٱلضُّحَىٰ وَٱلَّيۡلِ إِذَا سَجَىٰ ..... ﴾ الضحى(١-٢). دەبینین هیچ دابەشكردن و قافیەیەك لەم دەستەواژەی( والـضحى )دا نییـە ، بـەڵكو دەسـتەواژەیەكی سـادەیە و موسـیقایەكی نـاوەكی دەبارێنێت...

گـوێ لـەم ئایەتـە پیرۆزانـە بگـرە:﴿ قَالَ رَبِّ إِنِّي وَهَنَ ٱلۡعَظۡمُ مِنِّي وَٱشۡتَعَلَ ٱلرَّأۡسُ شَيۡبٗا وَلَمۡ أَكُنۢ بِدُعَآئِكَ رَبِّ شَقِيّٗا ﴾ مـــــریم(٤). وە:﴿ طه مَآ أَنزَلۡنَا عَلَيۡكَ ٱلۡقُرۡءَانَ لِتَشۡقَىٰٓ إِلَّا تَذۡكِرَةٗ لِّمَن يَخۡشَىٰ تَنزِيلٗا مِّمَّنۡ خَلَقَ ٱلۡأَرۡضَ وَٱلسَّمَٰوَٰتِ ٱلۡعُلَى ٱلرَّحۡمَٰنُ عَلَى ٱلۡعَرۡشِ ٱسۡتَوَىٰ ﴾ طه ( ١ – ٥ ).

هـــەروەها ئەگـــەر ئايەتـــەكان ترســـاندن و ئاگاداركردنـــەوەى تێـــدابێت دەستەواژەكان لەگەڵ پێكهاتەكەى دەگۆڕێت بۆ پارچە شاخێكى ڕەق و تونـد ، مۆسيقاكەى دەبێتـە دەنـگ و زەنگێكـى لـە مـس دروسـتكراو كـە گـوێى مـرۆڤ دەلـەرزێنێ ، خـودا دەفـەرموويت: ﴿ إِنَّآ أَرۡسَلۡنَا عَلَيۡهِمۡ رِيحٗا صَرۡصَرٗا فِي يَوۡمِ نَحۡسٖ مُّسۡتَمِرّٖ تَنزِعُ ٱلنَّاسَ كَأَنَّهُمۡ أَعۡجَازُ نَخۡلٖ مُّنقَعِرٖ ﴾ القمـر (١٩-٢٠). وشـەى وەكـو ( صرصـر ) واتـە، هەوايـەكى زۆر سـارد ، ( منقعـر ) واتـە، پەلكـەى كـەوتوو لـە دار، هـەر وشەيەك لەمانە وەكو پارچە بـەردێكى هاوێـژتووە...... كاتێـك ئايـەتێك دێـت ڕووداوێكـى گـەورە دەگێڕێتـەوە ، وەكـو ڕووداوى تۆفـانى نـووح ، لـەو كاتـە دەســـتەواژەكان زۆر كـــورت دەبـــن و دەڵـــێن نيـــشانەكانى ( مـــورس ) ن لـــە تەلەگرافدا ، ئايەتەكە هـەمووى دەبێتـە تەلـەگرافێكى كـورت و لـەناكاو، بـەڵام كاريگەريەكى زۆرى دەبێت:

﴿ وَقِيلَ يَٰٓأَرۡضُ ٱبۡلَعِي مَآءَكِ وَيَٰسَمَآءُ أَقۡلِعِي وَغِيضَ ٱلۡمَآءُ وَقُضِيَ ٱلۡأَمۡرُ وَٱسۡتَوَتۡ عَلَى ٱلۡجُودِيِّۖ وَقِيلَ بُعۡدٗا لِّلۡقَوۡمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾ هــود(٤٤).. واتــە: (پاشــان فەرمانــدرا بــە زەوى: ئاوەكەت با ڕۆبچێت بەناختدا، ئەى ئاسمان: تۆش با بەس بێت و باران مەبارێنـە، ئـيتر ئاوەكـە ڕۆچـوو، فـەرمانيش بـە ڕێكـى و تـەواوى ئەنجامـدرا، كەشتيەكەش لەسەر كێوى جودى وەستاو لەنگـەرى گـرت و وتـرا: دەك دوورى لە بەزەيى خوا و تياچوون بۆ بەرەى ستەمكاران)... ئەم ڕەنگدا و ڕەنگييە لـە دانـانى وشـەكان بـۆ دروسـتكردنى دەسـتەواژەكان ، گونجـانى ئـاوازى مۆسـيقاى وشەكان لەگەڵ ماناكان و هەستەكان ئاستێكى زۆر بەرزيان هەيە لە قورئانـدا ،

بە شێوازێکی ئاوا داڕێژراوە کە هیچ دانان و داڕێـژراوێك مانـدوو بـوونی تێـدا بەدی ناکرێت.

**سـێیەم:** ئەگەر ئێمە بـەردەوام بـین لـە شیکردنەوەی وشـەکان و لێکۆڵینـەوە لەسەر ئایەتەکانی قورئان ، زیاتر بۆمان روون دەبێتـەوە کـە چـەند وردەکاری زۆر و تونـد و رێکوپێکی گونجاوی لە نێـوان ئایەتـەکان و وشـەکان و پیتەکانـدا هەیە .

هـەر پیتێـك لـە شـوێنی خۆیـەتی ، پـێش و پاشـی لـە نێوانیانـدا ناکرێـت..... ناتوانین وشەیەك لە جیاتی وشەیەکی تر، یـان پیتێـك لـە جیـاتی پیتێکـی تـر دابنـێین. هــەر وشــەیەك لــە نێـوان ملیونــەها وشــەدا هەڵبــژێردراوە بــە هاوسەنگیەکی زۆر وردەوە.... دوای دەبینین ئەم فرە وردەکارییە لە نووسـراوە ئاسـاییەکانـدا بـەدی ناکرێـت. بـۆ نموونـە ئەگـەر لێکۆڵینـەوە لەسـەر وشـەی ( لواقح ) بکـەین، کـە لـە سـورەتی الحجـر هـاتووە:﴿ وَأَرْسَلْنَا ٱلرِّيَـٰحَ لَوَٰقِحَ .... ﴾ الحجر(٢٢). دەبینین لە کۆندا دەیانگوت لواقح مانایەکی وەرگیراوی ( مجازی ) هەیە . واتە با، یاخود هەواکان، هەورەکان دەجووڵێنن، باران دەبارێـت و خـاك و زەوی بە پیت دەکەن.

ئێستا زاناکان دەڵێن بایەکان هەورە بارگە موجەبـەکان دەجووڵێنێـت و لەگـەڵ هەورە بارگە سالبەکان یەکدەگرن هەور و تریشقە و ڕووناکی و بـاران دروسـت دەبێت........ هەروەها زاناکان دەڵێن بایەکان تۆوی نێر و مێ لە گوڵێکەوە بـۆ گوڵێکی تـر دەگوازنـەوە..... لـەم دوایـەدا دیـسان بۆیـان دەرکـەوتووە کـە بـاران نابارێت تا دلۆپە ئاوەکان لەگەڵ گەردیلەکانی تۆز لە هەوادا یەکنەگرن، پاشان دلۆپە باران دروست دەبێت و باران دەبارێت...... کەواتە وشەی ( لـواقح ) ئـەم

هەموو مانایانە لە خۆ دەگرێت . مانای وەرگێراو . مانای ڕاستەقینەی ، مانای زانستی ، لەلایەکی ترەوە وشەیەکی جوان و دلگیر و خاوەن مۆسقایەکی زۆرجوانە......لێرەوە بۆمان دەردەکەوێت وردی و چۆنیەتی هەڵبژاردنی وشەکان و ڕێکخستنیان.

لە ئایەتێکی تردا ئەم وردەکاریەمان بۆ دەردەکەوێت، خودای گەورە دەفەرمووێت:﴿ وَلَا تَأْكُلُوٓاْ أَمْوَٰلَكُم بَيْنَكُم بِٱلْبَٰطِلِ وَتُدْلُواْ بِهَآ إِلَى ٱلْحُكَّامِ .... ﴾ البقرە(١٨٨)...لێرەدا وشەی ( تدلوا ) واتە فڕێدان بۆ خوارەوە ، هەرچەندە لە ئایەتەکەدا باسی حاکم دەکات . کە دەبێت پارە بنێرێت بۆ سەرەوە، چونکە خۆی حاکمە لە سەرەوەیە نەك لە خوارەوە . بەڵام قورئانی پیرۆز ئەم مانایەمان بۆ ڕاستدەکاتەوە ، چونکە ئەو دەستەی پارە بە بەرتیل وەردەگرێت لە خوارەوەیە با دەستی حاکمیش بێت....... لەبەر ئەوە وشەی ( تدلوا ) بەکارهاتووە بۆ ئەوەی مانایەك بدات بە دەستەوە کە تیایدا پیسکەیی و کەم بایەخی مرۆڤی بەرتیلخۆر بەرجەستە بکات.

هەروەها لە ئایەتی جیهاد لە سورەتی التوبة هاتووە: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَا لَكُمْ إِذَا قِيلَ لَكُمُ ٱنفِرُواْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ٱثَّاقَلْتُمْ إِلَى ٱلْأَرْضِ .... ﴾ التوبە(٣٨).. ووشەی ( أثاقلتم ) بەکارهاتووە لە جیاتی ( تثاقلتم ) کە بە جۆرێك پیتەکان تێکخراون و پێکەوە لکاون هەتا ڕاستەقینەی مرۆڤە ترسنوکەکان دەرببرێت ، ئەوانەی لە ترسی شەڕ خۆیان دەشارنەوە و خۆیان بە زەوییەوە دەنوسێنن ، کەواتە گونجانێکی تەواو هەیە لەنێوان وشە و ئەو مانایەی کە دەیەوێت پێمان ڕابگەیەنێت.

هەروەها لەبارەی کوشتنی منداڵ لە ترسی هەژاری لە قورئانـدا بـە دوو شێواز هاتووە ، ئەم دوو شێوازە هەر لە خۆیەوە نەهاتووە بـەڵکو مەبەستێکی نادیار و شاراوەی هەیە ، لە سورەتی الأنفال دەفەرموویت:﴿ ...وَلَا تَقْتُلُوٓا۟ أَوْلَٰدَكُم مِّنْ إِمْلَٰقٍ ۖ نَّحْنُ نَرْزُقُكُمْ وَإِيَّاهُمْ .... ﴾ الانعـام(١٥١). وە لـە سـورەتی الأسـراء دەفـــــــەرموویت:﴿ وَلَا تَقْتُلُوٓا۟ أَوْلَٰدَكُمْ خَشْيَةَ إِمْلَٰقٍ ۖ نَّحْنُ نَرْزُقُهُمْ وَإِيَّاكُمْ ۚ إِنَّ قَتْلَهُمْ كَانَ خِطْـًٔا كَبِيرًا ﴾ الإسراء(٣١).. لە ئایەتی یەکەم برسێتی هەیە و خۆیـان هەژارن بە بەڵگەی ( من إملاق ) هەروەها بـە پێشخستنی وشـەی ( نـرزقکم ) واتە منداڵەکانتان نەکوژن لەبەر برسێتی خۆتان ئێمە خـوراکی ئێوە و ئـەوان دەدەین . لە ئایەتی دووەم برسێتی نییە، بەڵکو لە ترسی برسێتی لـە دوا رۆژ، بە بەڵگەی وشەی ( خشية إمـلاق ) هـەروەها پێشخستنی وشـەی ( نـرزقهم )، واتە منداڵەکانتان نەکوژن لە ترسـی برسـێتی ئێمـە خـوراکی ئـەوان و ئێوەش دەدەین . کەواتە ئەگەر هـەژار بـن منـداڵیان دەکوژن لەبـەر خۆیـان تـا برسـی نەبن ، لەبەر ئەوە خودا ناویان پێش دەخات دەڵێت ( نرزقكم و إياهم ) بـەڵام ئەگـەر لـە ترسـی برسـێتی بـوو لـە دوا رۆژ ، خـودای گـەورە پێیـان دەڵێـت ( نـرزقهم وإيـاكم ) . کەواتـە ئـەم پـێش و پاشـییە لـە وشـەکان مەبەسـتی پێـی هەبووە. کابرای نووسەر ناتوانێت ئەم حاڵەتە ڕەچاو بکات !

بە هەمان شێوە دەبینین وشەی ( السارق ) لـە پێشـیشی وشـەی ( الـسارقة ) دا هاتووە ، بـــەڵام دەبینین لە حـــاڵەتی زینا نـــاوی ( الزانية ) لە پـێش نـــاوی ( الزانـي ) هـاتووە کـە ئەمـەش هۆکارەکـەی روون و ئاشـکرایە...پیـاو هـەردەم ئامادەترە بۆ دزی لە ئافرەت لەبەرئەوە ناوی لە پێش ناوی ئافرەت هاتووە، بە

پێچەوانەوە لە حاڵەتی زینا ناوی ئافرەت لەپێش ناوی پیاو هاتووە ، چونکە ئافرەت هۆکارە بۆ زینا ، لاقی رووت دەکات ، لەبەر ئاوێنە دادەنیشێت. جل و بەرگی سەرنجڕاکێش لەبەر دەکات ، کەواتە ئافرەتە تەڵ بۆ پیاو دادەنێت:

﴿ ٱلزَّانِيَةُ وَٱلزَّانِى فَٱجْلِدُوا۟ كُلَّ وَٰحِدٍ مِّنْهُمَا مِا۟ئَةَ جَلْدَةٍ ... ﴾ النـــــور(٢). وە:﴿ وَٱلسَّارِقُ وَٱلسَّارِقَةُ فَٱقْطَعُوٓا۟ أَيْدِيَهُمَا جَزَآءًۢ بِمَا كَسَبَا نَكَٰلًا مِّنَ ٱللَّهِ ۗ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴾ المائدە(٣٨).. دەبینین لە قورئانی پیرۆزدا وشەی ( السمع ) واتە گوێ، یان بیستن ، لە پێش ( البصر )ـە، واتە دیتن یان بینین لە (١٦) ئایەتی قورئاندا:

﴿ وَٱللَّهُ أَخْرَجَكُم مِّنۢ بُطُونِ أُمَّهَٰتِكُمْ لَا تَعْلَمُونَ شَيْـًٔا وَجَعَلَ لَكُمُ ٱلسَّمْعَ وَٱلْأَبْصَٰرَ وَٱلْأَفْـِٔدَةَ ۙ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴾ النحل(٧٨

﴿ وَلَقَدْ مَكَّنَّٰهُمْ فِيمَآ إِن مَّكَّنَّٰكُمْ فِيهِ وَجَعَلْنَا لَهُمْ سَمْعًا وَأَبْصَٰرًا وَأَفْـِٔدَةً ﴾ الاحقاف(٢٦).

﴿ أَسْمِعْ بِهِمْ وَأَبْصِرْ يَوْمَ يَأْتُونَنَا ۖ لَٰكِنِ ٱلظَّٰلِمُونَ ٱلْيَوْمَ فِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴾ مريم(٣٨).

﴿ وَلَا تَقْفُ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌ ۚ إِنَّ ٱلسَّمْعَ وَٱلْبَصَرَ وَٱلْفُؤَادَ كُلُّ أُو۟لَٰٓئِكَ كَانَ عَنْهُ مَسْـُٔولًا ﴾ الإسراء(٣٦)

﴿ فَاطِرُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ جَعَلَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَٰجًا وَمِنَ ٱلْأَنْعَٰمِ أَزْوَٰجًا ۖ يَذْرَؤُكُمْ فِيهِ ۚ لَيْسَ كَمِثْلِهِۦ شَىْءٌ ۖ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْبَصِيرُ ﴾ الشورى(١١).

گومانی تێدا نییە کەوا کرداری بیستن ئاگادارتر و تەواوترە لە کرداری بینین، چونکە ئێمە گوێمان لە جنۆکە دەبێت، بەڵام نابینین ، پێغەمبەران گوێیان لە

خـودا بـووه قـسەيان لەگەڵـدا كـردووه ، بـەڵام نـەيانبينيوه. پێغەمبـەرمان محەمـەد (درووودی خـودای لـه سـەر بێـت) قورئـانی بـه بيـستن وەريگرتـووه . ئافرەت دەتوانێت لەناو قەرەباڵغێكی زۆر دەنگی منداڵەكەی بناسێتەوه، بـەبێ ئەوەی دەم و چـاوی ببينێـت . كـرداری بيـستن لـه كـاتی نووسـتن هـەر لەگـەڵ مرۆڤەكانـدايـه و بـه ئاگايـه بـەبێ ئـەوەی چـاوەكانی ببيـنن، ئـەو كەسەشـی توێكـاری گـوێی كردبێـت بـۆی دەركـەوتووه كـه زۆر گـەورەتر و وردتـره لـه چاو......

هـەروەها لـه ئايەتـەكان زۆر جـار وشـەی( المـال )لـه پـێش( الولـد ) بـەكاردێت. خودای گەوره دەفـەرمووێت:﴿ يَوْمَ لَا يَنفَعُ مَالٌ وَلَا بَنُونَ ‎ إِلَّا مَنْ أَتَى ٱللَّهَ بِقَلْبٍ سَلِيمٍ ﴾ الـشعراء(٨٨-٨٩). وه﴿ إِنَّمَآ أَمْوَٰلُكُمْ وَأَوْلَٰدُكُمْ فِتْنَةٌ ۚ وَٱللَّهُ عِندَهُۥٓ أَجْرٌ عَظِيمٌ ﴾ التغـــابن(١٥) . وه هـــەروەها: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لَن تُغْنِىَ عَنْهُمْ أَمْوَٰلُهُمْ وَلَآ أَوْلَٰدُهُم مِّنَ ٱللَّهِ شَيْـًٔا ۖ وَأُو۟لَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلنَّارِ ۚ هُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴾ آل عمـــــــران(١١٦). وه: ﴿ أَيَحْسَبُونَ أَنَّمَا نُمِدُّهُم بِهِۦ مِن مَّالٍ وَبَنِينَ ﴾ المؤمنون(٥٥).

﴿ فَلَا تُعْجِبْكَ أَمْوَٰلُهُمْ وَلَآ أَوْلَٰدُهُمْ ۚ إِنَّمَا يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيُعَذِّبَهُم بِهَا فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَتَزْهَقَ أَنفُسُهُمْ وَهُمْ كَٰفِرُونَ ﴾ التوبه(٥٥). وه: ﴿ ٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّمَا ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا لَعِبٌ وَلَهْوٌ وَزِينَةٌ وَتَفَاخُرٌۢ بَيْنَكُمْ وَتَكَاثُرٌ فِى ٱلْأَمْوَٰلِ وَٱلْأَوْلَٰدِ.... ﴾ الحديد(٢٠).

نموونـەی لـەم بابەتـه گـەلێك زۆره . نهێنيـەكـەش لەوەدايـه زۆربـەی خـەڵكی سەروەت و سامانيان پێ باشتر و له پێشتره له منداڵ.

گەورەیی قورئـان دیسان لـە وردەکاری و جوانی و نـەدیارەکانی شـیکردنەوە ( الإعـراب ) بەدیاردەکـەوێت ، بـا تـەماشـای ئـەم ئایەتـە پـیرۆزە بکـەین: ﴿ وَإِن طَآئِفَتَانِ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ٱقْتَتَلُواْ فَأَصْلِحُواْ بَيْنَهُمَا ۖ فَإِنۢ بَغَتْ إِحْدَىٰهُمَا عَلَى ٱلْأُخْرَىٰ فَقَـٰتِلُواْ ٱلَّتِى تَبْغِى حَتَّىٰ تَفِىٓءَ إِلَىٰٓ أَمْرِ ٱللَّهِ ۚ فَإِن فَآءَتْ فَأَصْلِحُواْ بَيْنَهُمَا بِٱلْعَدْلِ وَأَقْسِطُوٓاْ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُقْسِطِينَ ﴾ الحجرات(٩). جارێکیان وشەی (طائفتان ) کە (مثنـی) یـە واتـە دوو ، وەکو وشـەی کۆ ڕەچاوکراوە و وشـەی ( إقتتلوا ) لەگـەڵ بـەکارهاتووە ، جـارێکی تـر ڕەچـاوی مثنـی واتـە دوو بـۆ کـراوە وشـەی ( بینهمـا ) لەگـەڵ بەکارهاتووە...... ئەم نهێنیەش ئەوەیـە کاتێك دوو کۆمەڵە بەیـەك دەگەن و شەڕ دەکەن دەبنـە زۆر دەسـتەو تـاقم، بـەڵام لـە کـاتی ئاشـتبوونەوەدا دەبنـە کۆمەڵە و هەریەکـەیان کەسێك یـاخود نوێنـەرێك دەنێرێـت بـۆ ئاشـتبوونەوە لەگەڵ یەکتری.

هـەتا پیتـەکانی (جـر) و (وصـل) و (عطـف) هاتنیـان لـە قورئـانی پـیرۆزدا هۆکارگـەلێکی قـووڵی هەیـە، بەحـسابێکی مـەتینی ورد، بـۆ نموونـە وشـەی (یسألونك) لە زۆر شوێن لە قورئاندا هاتووە:

﴿ ....وَيَسْـَٔلُونَكَ مَاذَا يُنفِقُونَ قُلِ ٱلْعَفْوَ ۗ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمُ ٱلْـَٔايَـٰتِ لَعَلَّكُمْ تَتَفَكَّرُونَ ﴾ البقرە(٢١٩).

﴿ وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلرُّوحِ ۖ قُلِ ٱلرُّوحُ مِنْ أَمْرِ رَبِّى وَمَآ أُوتِيتُم مِّنَ ٱلْعِلْمِ إِلَّا قَلِيلًا ﴾ الإسراء(٨٥).

﴿ يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْأَهِلَّةِ ۖ قُلْ هِىَ مَوَٰقِيتُ لِلنَّاسِ وَٱلْحَجِّ .... ﴾ البقرە(١٨٩).

لەم ئایەتە پیرۆزانەدا وەڵامەکەی بە (قل) دەست پێدەکات ، تەنها لەو ئایەتە نەبێت کە پرسیار لە چیایەکان دەکرێت:﴿ وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلۡجِبَالِ فَقُلۡ يَنسِفُهَا رَبِّي نَسۡفٗا ﴾ طـه (١٠٥).. لێرەدا وەڵامەکەی بە ( فقل ) لە جیاتی ( قل ) هاتووە...... هۆیەکەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە لە پرسیارەکانی پێشوو بە ڕاستی پرسیار کراوە و وەڵامەکە دراوەتەوە ، تەنها پرسیار لەبارەی چیایەکان نەبێت هێشتا نەکراوە . لەبەرئەوە وەڵامەکە بە ( فقل ) هاتووە . کە ئەمەش نهێنیەکە لە نهێنیەکانی رۆژی دوایی...... کەواتە پرسیارەکە بەم شێوازە کراوە: ئەگەر پرسیارت لێکرا دەربارەی چیایەکان تۆ بڵێ واتە (فقل ) ...... لێرە پیتی ( فاء ) هاتووە وەك زیادەیەك بۆ هۆکارێك کە مەبەستی پێ هەبووە.

بەڵام لە ئایەتی:﴿ وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِي عَنِّي فَإِنِّي قَرِيبٌۖ أُجِيبُ دَعۡوَةَ ٱلدَّاعِ إِذَا دَعَانِۖ فَلۡيَسۡتَجِيبُواْ لِي وَلۡيُؤۡمِنُواْ بِي لَعَلَّهُمۡ يَرۡشُدُونَ ﴾ البقـرە(١٨٦). وشەی (قل) نەهاتووە، چونکە پرسیارەکە لەبارەی خودایە ، خودا لە هەموویان لە پێشترە، هەر خۆی وەڵام دەداتەوە . کەواتە ئەگەر شتێکت ویست تەنها بۆ خودا بگەڕێوە و پێویستییەکەت بە ئەو بڵێ.

هەروەها ڕاناوی ( أنا ) و ( نحن ) زۆر لە ئایەتەکاندا دیارە ، کاتێك خودای گەورە باسی کارێکی خۆی دەکات بە ڕاناوی ( کۆ ) باس دەکات، تا هەموو سیفەتەکانی ئەو وەکو دروستکردن ، هێنانە خوارەوەی قورئان ، تیایدا بەشدار بن.

﴿ إِنَّآ أَنزَلۡنَٰهُ فِي لَيۡلَةِ ٱلۡقَدۡرِ ﴾ القدر(١). وە:﴿ إِنَّا نَحۡنُ نَزَّلۡنَا ٱلذِّكۡرَ وَإِنَّا لَهُۥ لَحَٰفِظُونَ ﴾ الحجــــــــــــر(٩). وە: ﴿ أَفَرَءَيۡتُم مَّا تُمۡنُونَ ءَأَنتُمۡ تَخۡلُقُونَهُۥٓ أَمۡ نَحۡنُ ٱلۡخَٰلِقُونَ ﴾ الواقعە(٥٨-٥٩). زۆر ئایـەتی تـری لـەم بابەتـە....... کەواتـە ڕانـاوی ( نحـن )، هـەموو سـیفاتەکانی خـودا کـۆ دەکاتــەوە. کـە داهێنــان دەکـەن لـە کـاری دروستکردندا.

بەڵام کاتێك خودای گەورە گفتوگۆ لەگەڵ پێغەمبـەران دەکات ، وەکو لەگەڵ موسـا، بـە ڕانـاوی تـاك باسـی دەکـات:﴿ إِنَّنِيٓ أَنَا ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنَا۠ فَٱعۡبُدۡنِي وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ لِذِكۡرِيٓ ﴾ طـە(١٤). خـودا دەڵێـت ( أنـا ) واتـە: مـن، چـونکە لێـرە تەنها خودایە قسە دەکات ، بۆ ئـەوەی ئاگادارمـان بکاتـەوە لـە یەکتاپەرستی و عیبادەت ، کە تەنها بۆ ئەوە.

تایبـەت بـە سـەبر و ئـارامگرتن بـە هـەمان شـێوە دەبیـنین لـە دوو ئایـەتی جیاوازدا هەریەك بـۆ مەبەستێك بـەکارهاتووە. خـودا دەفـەرموێت: ﴿ يَٰبُنَيَّ أَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ وَأۡمُرۡ بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَٱنۡهَ عَنِ ٱلۡمُنكَرِ وَٱصۡبِرۡ عَلَىٰ مَآ أَصَابَكَۖ إِنَّ ذَٰلِكَ مِنۡ عَزۡمِ ٱلۡأُمُورِ ﴾ لقمـان(١٧). ئایــەتی دووەم دەڵێــت:﴿ وَلَمَن صَبَرَ وَغَفَرَ إِنَّ ذَٰلِكَ لَمِنۡ عَزۡمِ ٱلۡأُمُورِ ﴾ الشوری(٤٣).

لـە ئایـەتی یەکـەم ( مـن عـزم الأمـور ) لـە ئایەتی دووەم (لـمن عـزم الأمـور ). نهێنیەکە لە پیتی ( لام ) دایە، کـە دەبێـت ئارامگرتنەکـە دوو ئـەوەنـدە بێـت ، چونکە ئارامگرتن لە ئایەتی یەکەمدا لەسەر قەزا و قەدەری خودایە کە مـرۆڤ هیـچ چارەیەکی بەدەستەوە نییە ، بەڵام ئارامگرتن لە ئایەتی دووەمـدا لەسـەر

خراپی و دوژمنكاری دوژمنەكانە دژی مرۆڤ، كە دەبێت زیاتر ئارامبگرێت، ئەمە سەختترە لەسەر مرۆڤ.
دیسان تێبینیمان هەیە لەسەر پیتی ( لام ) لە دوو ئایەتی تر دەربارەی هاتنی باران لەگەڵ شینبوونی بەروبووم:﴿ ءَأَنتُمْ أَنزَلْتُمُوهُ مِنَ الْمُزْنِ أَمْ نَحْنُ الْمُنزِلُونَ لَوْ نَشَاءُ جَعَلْنَاهُ أُجَاجًا فَلَوْلَا تَشْكُرُونَ ﴾ الواقعه(٦٩-٧٠). هەروەها لە ئایەتی دووەم:﴿ لَوْ نَشَاءُ لَجَعَلْنَاهُ حُطَامًا فَظَلْتُمْ تَفَكَّهُونَ ﴾ الواقعه(٦٥)...لە ئایەتی یەكەم ( جعلناه أجاجاً ) واتە سوێرمان كرد. لە ئایەتی دووەم ( لجعلناه حطاماً ) واتە: وشككیان دەكەین. لەم ئایەتەدا پیتی ( لام ) چووەتە سەر ( جعلناه ) بۆ سوێند و سووربون، چونكە لەوانەیە كەسانێك هەبن بتوانن بەروبووم لەناو ببەن و وشك بكەن. بەڵام كەس ناتوانێت هەور و باران دروست بكات، بارانێكی سوێر بهێنێتە خوارەوە. لەبەر ئەوە پێویستی بە ( لام ) نییە بۆ سووربوون.
هەمان وردەكاری لە ئایەتەكان دەبینین كاتێك خودا باسی ئیبراهیم پێغەمبەر دەكات و دەفەرمووێت:﴿ وَالَّذِي يُمِيتُنِي ثُمَّ يُحْيِينِ ﴾ الشعراء(٨١). وە دەفەرمووێت:﴿ وَالَّذِي هُوَ يُطْعِمُنِي وَيَسْقِينِ ﴾ الشعراء(٧٩). ..دەبینین كاتێك باسی خواردن دەكات ڕاناوی ( هو ) لە پێش دەهێنێت ، چونكە لەوانەیە هەمووان بڵێن ئێمە خواردن و خواردنەوەمان پێداوە ، لە بەرامبەردا كاتێك باسی مردن و زیندووبوونەوە دەكات ڕاناوی ( هو ) لەگەڵ بەكارناهێنێت ، چونكە تەنها خودا توانای مراندن و زیندووكردنەوەی هەیە. پێویست ناكات تەوكید لەگەڵ بەكاربهێنێت. خودای گەورە كاتێك قسە لەگەڵ موسڵمانان

دەکـــات پێیـــان دەڵێـــت:﴿ فَٱذۡكُرُونِيٓ أَذۡكُرۡكُمۡ وَٱشۡكُرُواْ لِي وَلَا تَكۡفُرُونِ ﴾ البقرە(١٥٢).. بەڵام کاتێك قسە لەگەڵ جولەکەکان دەکات پێیـان دەڵێـت:﴿ يَٰبَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ ٱذۡكُرُواْ نِعۡمَتِيَ ٱلَّتِيٓ أَنۡعَمۡتُ عَلَيۡكُمۡ وَأَوۡفُواْ بِعَهۡدِيٓ أُوفِ بِعَهۡدِكُمۡ وَإِيَّٰيَ فَٱرۡهَبُونِ ﴾ البقـرە(٤٠). چـونکە خـودای گـەورە دەزانێت جولەکـەکان مرۆڤـی ماددین ، تەنها لەکاتی هەبوونی ناز و نیعمەتی خودا بیری خودا دەکەن، بـەڵام موسـڵمانەکان، هـەردەم بـیری خـودا دەکـەن، نـەك لـە پێنـاو بەرژەوەندیـەکی ماددی.

بە هەمان ڕێساوە دەبینین کاتێك خودا قسە بۆ مرۆڤە ژیرەکان دەکات دەڵێت: ﴿ وَٱتَّقُونِ يَٰٓأُوْلِي ٱلۡأَلۡبَٰبِ ﴾ البقـرە(١٩٧). بـەڵام کاتێـك قـسە بـۆ مرۆڤـە ئاسـاییەکان دەکـات پێیـان دەڵێـت: ﴿ فَإِن لَّمۡ تَفۡعَلُواْ وَلَن تَفۡعَلُواْ فَٱتَّقُواْ ٱلنَّارَ ٱلَّتِي وَقُودُهَا ٱلنَّاسُ وَٱلۡحِجَارَةُۖ أُعِدَّتۡ لِلۡكَٰفِرِينَ ﴾ البقـــرە(٢٤).. چـــونکە مرۆڤـــە ئاساییەکان دەست لە کاری خراپ هەڵناگرن بە ترساندن نەبێت بە ئاگر. بەڵام مرۆڤە ژیرەکان پێویست ناکات بە ئاگر بترسێنرێن، چونکە لـە خـودا دەترسـن و دەزانن خودا دەتوانێت ئاگر بکاتە خۆشی و ئارامی بۆیان.

دیســان شەیتان کاتێك سوێند دەخوات، سوێند بــە گـەورەیی خـودا دەخـوات: ﴿ قَالَ فَبِعِزَّتِكَ لَأُغۡوِيَنَّهُمۡ أَجۡمَعِينَ ﴾ ص(٨٢). چـونکە شـەیتان دەیزانــی تـەنها گەورەیی خودایە وادەکات کە خـودا پێویـستی بـە دروسـتکراوی خـۆی نـەبێت. ئەو کەسەی حەز دەکات بڕوا بهێنێت، با بڕوا بهێنێت، ئـەوەی بـڕوا نـەهێنێت بـا بـڕوا نـەهێنێت ، خـودا پێویـستی بـە کـەس نییـە. گـەورەیی ئـەو بەسـەر

هەموویانەوەیە . ئەوانەی لە بەهەشتن یان لەناو ئاگرن هیچیان بەسەر خوداوە نییە. ئەم خاڵەیە کەوا شەیتان دەتوانێت خەڵك بەسەردا ببات و دڵیان تاریك بکات، چونکە خودای گەورە زۆری لەو کەسە ناکات کە بێ باوەڕی بۆ خۆی هەڵدەبژێرێت لەبەرئەوە شەیتان دەڵێ:﴿ قَالَ فَبِعِزَّتِكَ لَأُغْوِيَنَّهُمْ أَجْمَعِينَ ﴾ واتە: (بە گەورەیی لەخشتەیان دەبەم). وە شەیتان دەڵێت:﴿ قَالَ فَبِمَآ أَغْوَيْتَنِي لَأَقْعُدَنَّ لَهُمْ صِرَٰطَكَ ٱلْمُسْتَقِيمَ ثُمَّ لَءَاتِيَنَّهُم مِّنۢ بَيْنِ أَيْدِيهِمْ وَمِنْ خَلْفِهِمْ وَعَنْ أَيْمَٰنِهِمْ وَعَن شَمَآئِلِهِمْ وَلَا تَجِدُ أَكْثَرَهُمْ شَٰكِرِينَ ﴾ الاعراف(١٦-١٧).. سوێند دەخوات لە هەر چوار لاوە بۆیان دێم، لە پێشەوە ، لە پاشەوە ، لەلای ڕاستەوە ، لە لای چەپەوە ، بەڵام باسی لای سەرێ و خوارێ ناکات ، لە لای سەرەوە پەروەردگاری لێیە ، لە خوارەوەش مانای ملکەچ بوون و بەندایەتی دەگەیەنێت ، چونکە ئەو کەسەی شوێنی بەندایەتی دەگرێت و پەیوەندی لەگەڵ خودای ئاسمانەکان دروست دەکات شەیتان ناتوانێت بێتە نێوانیانەوە.

پاشان شەیتان دەڵێت باشترین ڕێگا بۆ گومڕاکردنی مرۆڤەکان ، لادانیانە لە ڕێگای ڕاست ، ڕێگای چاکە ، ڕێگای نوێژ ، چونکە ئەوەی نوێژ نەکات . یان سەرخۆشە یان فێلباز و خراپەکارە ، پێویست ناکات شەیتان خۆی لەگەڵیان ماندوو بکات ، نەفسی خراپی خۆیان بەسە بۆ گومڕاکردنی ئەوان....... ئەمانە مرۆڤی تێکدەرن ، شەیتانیش دزێکی ژیرە، حەز ناکات کاتی خۆی بکوژێت بە سووڕانەوە بە دەوری ماڵێکی وێراندا.

نموونەیەکی تر لەسەر وردەکاریەکانی قورئانی پیرۆز لەوەدا بە دیار دەکەوێت کاتێك دەبینین لە ئایەتەکاندا وشەی ( مغفرة ) واتە لێخۆشبوون لە پێشەوەی

وشەی ( العذاب )ەوە هاتووە، واتە، ئازاردان ، هەروەها وشەی ( الرحمة ) واتە، بەزەیی، هەردەم لە پێشەوەی وشەی ( الغضب ) ە هاتووە، واتە تووڕەیی لە قورئانی پیرۆزدا . لە سورەتی الفاتحة خودای گەورە ﴿ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ ﴾ لە پێشەوەی ﴿ مَالِكِ يَوْمِ الدِّينِ ﴾ دێت...... بە هەمان شێوە لە ئایەتەکاندا دەڵێت: ﴿ وَلِلَّهِ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ ۚ يَغْفِرُ لِمَن يَشَاءُ وَيُعَذِّبُ مَن يَشَاءُ ۚ وَكَانَ اللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴾ الفتح(١٤)..... لێخۆشبوون لە پێش ئازاردان دێت لە هەموو ئایەتەکان، تەنها لە دوو شوێن نەبێت ، یەکەمیان: کاتێك باسی بڕینی دەستی دزیکەر دەکات، دەڵێت: ﴿ أَلَمْ تَعْلَمْ أَنَّ اللَّهَ لَهُ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ يُعَذِّبُ مَن يَشَاءُ وَيَغْفِرُ لِمَن يَشَاءُ ۗ وَاللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴾ المائدە(٤٠).. چونکە دەستبڕین سزایەکی دونیاییە لە دونیادا، لە رۆژی دواییدا لێخۆشبوونی بەسەردا دێت. دووەمیان: قسە و بڕیاری عیسا پێغەمبەرە بۆ ئەو کەسانەی کە لە دونیادا عیبادەتی ئەویان کردووە ، لە رۆژی دواییدا بە خودای گەورە دەڵێت:﴿ إِن تُعَذِّبْهُمْ فَإِنَّهُمْ عِبَادُكَ ۖ وَإِن تَغْفِرْ لَهُمْ فَإِنَّكَ أَنتَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ ﴾ المائدە (١١٨). واتە: (ئەگەر سزایان دەدەی ئەوان بەندەی تۆن ، وە ئەگەر لێیان خۆش دەبی هەر ئەتۆی گەورە و خاوەن بڕیارو شتەکان دەزانی)..... واتە عیسا پێغەمبەر ، چونکە تاوانەکەیان زۆر گەورە بووە ، نەیتوانیوە وەك ئەدەبێك بەرامبەر بە خودا لە پێشدا داوای لێخۆشبوونیان بۆ بکات.

خودای گەورە کاتێك باسی رۆژی دوایی دەکات ، هەموو ئەو رووداوانەی کە لەم رۆژەدا روودەدەن بە شێوەی ڕابردوو باس دەکات، هەرچەندە رۆژی دوایی

نەهاتووە ، کەواتە خودای گەورە باسی دوا ڕۆژمان بۆ دەکات، بەڵام بە شێواز و فرمانی ڕابردوو. دەفەرموویت:

﴿ وَتَرَكۡنَا بَعۡضَهُمۡ يَوۡمَئِذٖ يَمُوجُ فِي بَعۡضٖۖ وَنُفِخَ فِي ٱلصُّورِ فَجَمَعۡنَٰهُمۡ جَمۡعٗا ﴾ الكهف(٩٩).

﴿ وَٱنشَقَّتِ ٱلسَّمَآءُ فَهِيَ يَوۡمَئِذٖ وَاهِيَةٞ ﴾ الحاقە(١٦)..

﴿ وَبُرِّزَتِ ٱلۡجَحِيمُ لِلۡغَاوِينَ ﴾ الشعراء(٩١).

﴿ وَعُرِضُواْ عَلَىٰ رَبِّكَ صَفّٗا لَّقَدۡ جِئۡتُمُونَا كَمَا خَلَقۡنَٰكُمۡ أَوَّلَ مَرَّةِۭۚ بَلۡ زَعَمۡتُمۡ أَلَّن نَّجۡعَلَ لَكُم مَّوۡعِدٗا ﴾ الكهف(٤٨). ....نهێنیەکە لێرەدایە کە هەرچی ڕووداوەکانن بە ڕابردوو و داهاتوو وە، هەر هەموویان لە زانستی خودا ڕوویانداوە ، خودا پێیان دەزانێت چونکە خودا لە سەرەوەی کات و شوێنەکانە. هەر لەبەر ئەوەشە هەندێك جار دەبینین خودای گەورە باسی دوو کاتی جیا دەکات ، لەبەر چاو دەڵێین ئەمە دوو شتی دژی یەکترن وەکو ئەم ئایەتە: ﴿ أَتَىٰٓ أَمۡرُ ٱللَّهِ فَلَا تَسۡتَعۡجِلُوهُۚ سُبۡحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يُشۡرِكُونَ ﴾ النحل(١). ..لێرەدا خودای گەورە باسی شتێك دەکات کە بە ڕاستی ڕوویداوە لە ڕابردوو، بەڵام قسەمان لەگەڵ دەکات و دەڵێت پەلە مەکەن هەروەکو بڵێی داهاتووە ڕووینەداوە........ ڕاستییەکەش ئەوەیە کە ئەم ڕووداوە لە زانستی خودادا ڕوویداوە . بەڵام لە زانستی مرۆڤەکاندا ڕووینەداوە، بۆیە لێرەدا هیچ دژایەتییەکی نیە، بەڵکو وردەکاری و موحکەمی و پڕ ماناییە، نهێنی و ڕاستییە بۆ هەندێك مانای قووڵ.

ئەمانە هەندێك نموونەن لەسەر ڕەوانبێژی و وردەکارییە زمانەوانییەکان بۆ دروستکردنی دەستەواژەکانی قورئانی پیرۆز ، هەروەها نموونەن لەسەر هەڵبژاردنی وشەکان و بەکارهێنانی پیتەکان کە هیچ کەمی و زیادە یان پێش و پاشی تیایدا نیە ، بەڵکو بە ئامار و هاوسەنگیەکی زۆر ورد دانراوە ، هەر لەبەر ئەم هۆیەشە ئەم وردەکارییە لە هیچ کتێب و نووسراوێکدا بوونی نییە . تەنها لە قورئاندا نەبێت.

لەبارەی زانستی قورئان و سەیر و سەمەرە گەردوونییەکانەوە کە هەموویان نهێنی و شتی شاراوەبوون ، لەم سەردەمە دۆزراونەتەوە ، کە محەمەد هیچی لە بارەیانەوە نەدەزانی ، ئەمە بابەتێکی ترە زۆر درێژە، پێویستی بە دانیشتنێکی تر هەیە.

# بەشی دوانزەهەم

## - ناکرێت قورئان دروستکراو بێت

بە هاوڕێیەکەم گوت: لەوانەیە قسەی ئەمڕۆمان لەبارەی هەندێك ئاماژە و سەرنجە زانستیەکانی قورئانەوە زیاتر لە دانیشتنی ڕابردوومان هەستە زانستیەکەت بجووڵێنێت. نەك زانستە ئاسمانییە نوێیەکان ، زانستە گەردیلەیەکان ، زانستە زیندەوەریەکان و زانستی توێکاری ، هیچیان بوونیان نەبوو. کاتێك ئایەتەکانی قورئان دابەزین لە بارەی گەردوونەوە. پێش هەزار و چوار سەد ساڵ ، کە باسی ئاسمانەکان و زەوی و ئەستێرەکان ، دروستبوونی کۆرپەلە و پێکهاتەی مرۆڤ کە بگونجێت لەگەل زانستەکانی ئەم سەردەمە . ئەم بابەتانە بە درێژی لە قورئاندا باس نەکراون، چونکە ئەم قورئانە بە پلەی یەکەم کتێبێکە لەبارەی بیروباوەڕ و پەیڕەو و شەریعەت قسە دەکات.

ئەگەر قورئان بە درێژی باسی بابەتە زانستیەکانی کردبایە عەرەبەکانی دوورگە تێنەدەگەیشتن و دژایەتی لە نێوان ئەوان و قورئاندا دروست دەبوو. لەبەرئەوە قورئان بە نیشانە و ئاماژە و ناڕاستەوخۆ باسی ئەم بابەتانەی کردووە؛ تا زانستەکانی ئەم سەردەمە هاتن و ڕوونکردنەوەیان داوە بۆ ئەم نیشانە و ئاماژانە. هەر لەبەر ئەوەشە ساڵ بە ساڵ ، نەوە بە نەوە معجیزات و بەڵگەکان لەسەر ڕاستی و ڕەوایی ئەم قورئانە پەیدا دەبن، کەوا کتێبێکە لە لای خوداوە دابەزیوە، خودای گەورە دەفەرموویت:﴿ سَنُرِيهِمْ ءَايَٰتِنَا فِى ٱلْءَافَاقِ وَفِىٓ أَنفُسِهِمْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ ٱلْحَقُّ ۗ أَوَلَمْ يَكْفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ شَهِيدٌ ﴾ فصلت(٥٣). واتە: ( ئێمە لە ئایندەدا بەڵگە و نیشانەی سەرسوڕهێنەریان نیشان دەدەین لە ئاسۆکانی بوونەوەردا و لە خودی خۆیشیاندا، ئەمەش بۆ ئەوەی تا چاك بۆیان ڕوون بێت و دڵنیا بن کە ئەو زاتە حەق و ڕاست و ڕەوایە، ئایا شایەتی پەروەردگارت بەس نییە کە بێگومان ئاگا و زانایە بە هەموو شتێك؟!)..... چونکە ئەوانە بڕوا ناهێنن تەنها بە قسە و دانپێنانی خودای گەورە ، لەبەرئەوە زۆر گرنگ بوو بە هەندێك بەڵگەی بینراو بسەلمێنێ کە ئەم قورئانە ڕاستە...... بەم شێوەیە خودای گەورە لە قورئاندا باس دەکات. بە بەردەوام ڕۆژ بە ڕۆژ قورئانی پیرۆز ئەم ڕووداو و بەڵگە سەرسوڕهێنەرانە بۆمان دیار دەکات...... تایبەت بە گۆی زەوی ئایەتەکان بە ڕوون و ئاشکرایی وشەی ( التكوير ) واتە: بە بازنەکراو، بەکاردەهێنێت ، کە چۆن شەو و ڕۆژ بەدوای یەکدا دێن لە نیوەی گۆی زەوی ﴿ ...يُكَوِّرُ ٱلَّيْلَ عَلَى ٱلنَّهَارِ وَيُكَوِّرُ ٱلنَّهَارَ عَلَى ٱلَّيْلِ ۖ وَسَخَّرَ ٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ ۖ

﴿ كُلٌّ يَجْرِي لِأَجَلٍ مُّسَمًّى أَلَا هُوَ الْعَزِيزُ الْغَفَّارُ ﴾ الزمر(٥). واتە: ( ...شەو بەسەر ڕۆژدا دەهێنێت، بەهەمان شێوەی کەوانەیی ڕۆژیش بەسەر شەودا دەهێنێت، ڕۆژ و مانگیشی ڕام کردووە و ڕای هێناون، هەریەك لەوانە لە چەرخ و خولدان تا کاتێکی دیاریکراو، ئاگاداربن: هەر ئەو خوایە زۆر بە دەسەڵات و لێخۆشبووە)..... پاشان ئایەتێکی تر دێت باسی هێلکەیی زەوی دەکات: ﴿ وَالْأَرْضَ بَعْدَ ذَٰلِكَ دَحَاهَا ﴾ النازعات(٣٠).. واتە: (دواتر زەویشی بە شێوەیەکی هێلکەیی بەدیهێناوە)....... هەروەها وشەی ( دحاها )، تەنها وشەیەکە کە لە فەرهەنگی عەرەبیدا هاتووە کە مانای درێژکردنەوە و خڕکردنەوە لە خۆ دەگرێت...... زەویش هەروەکو دیار و بەرچاوە درێژکراوەیە ، بەڵام لە ڕاستیدا زەوی خڕ و لێوارەکانی بە یەکگەیشتوون ، زۆر نزیکە لە شێوەی هێلکەیی لە بەیەك گەیشتنەوەی لێوارەکانی.

ئایەتێکی تر لە قورئان دەخوێنین کە زۆر بە ڕوونی ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە چیایەکان لە بۆشاییدا جووڵە دەکەن ، کەواتە بەم پێیە زەوی بە چیایەکانییەوە هەردووکیان وەك یەك پارچە جووڵە دەکەن :

﴿ وَتَرَى الْجِبَالَ تَحْسَبُهَا جَامِدَةً وَهِيَ تَمُرُّ مَرَّ السَّحَابِ صُنْعَ اللَّهِ الَّذِي أَتْقَنَ كُلَّ شَيْءٍ إِنَّهُ خَبِيرٌ بِمَا تَفْعَلُونَ ﴾ النمل(٨٨). واتە:(تۆ کێوەکان دەبینیت وا دەزانیت کە وەستاون و بێ جووڵەن، لە کاتێکدا کە ئەوانیش وەکو هەور لە جووڵەدان، ئەمەیە دەستکردی ئەو خوایەی کە هەموو شتێکی بەو پەڕی ڕێکوپێکی دروستکردووە، بەڕاستی ئەو زاتە زۆر ئاگایە بەو کاروکردەوانەی کە ئەنجامی دەدەن).

**کەواتە ئەو چیایانەی پێمانوایە جێگیرن و ناجوولێن ، لە ڕاستیدا لە بۆشاییدا هاتوچۆیان هەیە....... کاتێك چیاکان بە هەورەکان دەچوێنێت، تێبینیەکی تری تێدایە لەسەر لاوازی پێکهاتەی مادده ، چیاکان کە لە گەردیلەکان پێکهاتوون ، هەورەکانیش لە دلۆپەکان پێکهاتوون.**

**ئاماژەیەکی تر لەسەر هێلکەیی گۆی زەوی ، ئەویش شەو و ڕۆژن، کە هەردووکیان پێکەوە پەیدا دەبن، بەبێ ئەوەی یەکێکیان پێش ئەوی تریان بکەوێت هەریەکەیان نیوەی گۆی زەوی داگیر دەکەن لە هەمان کاتدا: ﴿ لَا ٱلشَّمۡسُ يَنۢبَغِي لَهَآ أَن تُدۡرِكَ ٱلۡقَمَرَ وَلَا ٱلَّيۡلُ سَابِقُ ٱلنَّهَارِۚ وَكُلّٞ فِي فَلَكٖ يَسۡبَحُونَ ﴾ یس(٤٠). واتە: (نە خۆر بۆی هەیە بە مانگ بگات، نە شەویش پێش ڕۆژ دەکەوێت، بەڵکو هەریەکەیان لە خولگەی تایبەتی خۆیاندا مەلە دەکەن و بە ئاسانی دەسوڕێنەوە).. . بۆیە ئەگەر گۆی زەوی درێژکراوەیی بێت ، لەوکاتە هەریەکەیان لەدوای تەواو بوونی ئەوی تر دادەهات. نەك هەبوونی هەردووکیان لە یەك کاتدا.**

**ئەم حاڵەتە ، واتە هەبوونی شەو و ڕۆژ لە یەك کاتدا بەردەوام دەبێت تا ڕۆژی دوایی:﴿ .....حَتَّىٰٓ إِذَآ أَخَذَتِ ٱلۡأَرۡضُ زُخۡرُفَهَا وَٱزَّيَّنَتۡ وَظَنَّ أَهۡلُهَآ أَنَّهُمۡ قَٰدِرُونَ عَلَيۡهَآ أَتَىٰهَآ أَمۡرُنَا لَيۡلًا أَوۡ نَهَارٗا فَجَعَلۡنَٰهَا حَصِيدٗا كَأَن لَّمۡ تَغۡنَ بِٱلۡأَمۡسِۚ كَذَٰلِكَ نُفَصِّلُ ٱلۡأٓيَٰتِ لِقَوۡمٖ يَتَفَكَّرُونَ ﴾ یونس(٢٤). واتە: ( ....هەتا کاتێك وای لێ دێت زەوی، بە جوانی نەخش و نیگاری خۆی دەردەخات و خۆی دەڕازێنێتەوە، خەڵکەکەی واگومان دەبەن بەڕاستی هەمیشە دەسەڵاتداری تەواون بەسەریدا، ئەوە فەرمانی ئێمەیان بۆ دەردەچێت لەشەودا یان لە**

ڕۆژدا، ئەوسا وەك كشتوكاڵی درویَنە كراوی لێدەكەین، هەروەكو دوێنێ نەبوویێت، ئا بەو شێوەیە ئایەتەكانی خۆمان ڕوون دەكەینەوە بۆ كەسانێك بیربكەنەوە و تێفكرن )...... لێرەدا كە دەڵێت: ( ليلاً أو نهاراً ) واتە: بە شەو یان بە ڕۆژ، بەڵگەیە بۆ ئەوەی كەوا نیوەی گۆی زەوی تاریكاییە و ڕۆژ لێی ون دەبێت ، نیوەكەی تری ڕووناكە و ڕۆژی لێیە . بەهۆی ئەوەی كە گۆی زەوی خڕ و هێلكەییە. چونكە ئەگەر گۆی زەوی درێژكراوەیی بوایە دەبوایە تەنها یەك ڕووی هەبوایە. تاریكی یان ڕووناكی ، لەو كاتە دروست نەدەبوو بلێین:
﴿ ولا الليل سابق النهار ﴾ واتە:( شەویش بە پێش ڕۆژ ناكەوێت).
هەروەها خودای گەورە لە قورئاندا بە زۆر شێواز باس لە شوێنی ڕۆژهەلاتن و ئاوابوون دەكات و دەفەرمووێت:﴿ فَلَآ أُقۡسِمُ بِرَبِّ ٱلۡمَشَٰرِقِ وَٱلۡمَغَٰرِبِ إِنَّا لَقَٰدِرُونَ ﴾ المعارج(٤٠). واتە: (جا سوێند بە پەروەردگاری خۆرهەڵاتەكان و خۆرئاواكان، بە ڕاستی ئێمە هەمیشە بەدەسەڵاتین لەسەر)... كەواتە ڕۆژ زۆر شوێنی هەڵاتن و ئاوابوونی هەیە . هەروەها دەفەرمووێت:﴿ رَبُّ ٱلۡمَشۡرِقَيۡنِ وَرَبُّ ٱلۡمَغۡرِبَيۡنِ ﴾ الرحمن(١٧). واتە: (خوا خاوەنی هەردوو ڕۆژهەڵات و هەردوو ڕۆژئاوایە)... كەواتە ئەگەر زەوی درێژكراوەیی بوایە. لەو كاتە دەبوایە تەنها یەك ڕۆژهەڵات و یەك ڕۆژ ئاوابوونی هەبوایە.

لە ڕۆژی قیامەت مرۆڤ بە شەیتانەكەی دەڵێت:﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَنَا قَالَ يَٰلَيۡتَ بَيۡنِي وَبَيۡنَكَ بُعۡدَ ٱلۡمَشۡرِقَيۡنِ فَبِئۡسَ ٱلۡقَرِينُ ﴾ الزخرف(٣٨).. واتە: (تا ئەو كاتەی خەڵەتاوە كە دێتە لامان ئەوە بە شەیتانەكەی دەڵێت: خۆزگە نێوانی من و تۆ بە قەدەر ڕۆژهەلات و ڕۆژئاوا لە یەك دوور بوایە، ئای كە هاوڕێیەكی نا

لەبارو خراپ بوویت)..... واتە دوو رۆژهەڵات دروست نابێت ئەگەر زەوی خڕ و هێلکەیی نەبێت. لەوکاتە دوورترین دووری، یان ماوە دروست دەبێت کاتێک زەوی خڕ و هێلکەیی بێت.

پاشان قورئان باسی ئاسمانەکان و ئەوانەی لە ئاسماندا هەیە دەکات، وەکو رێڕەو و رێگا باس دەکات و دەفەرمووێت:﴿ وَٱلسَّمَآءِ ذَاتِ ٱلۡحُبُكِ ﴾ الذاريات(٧).. واتە: (سوێند بە ئاسمانی خاوەن رێگە و رێک وپێک و ڕازاوە). هەروەها دەفەرمووێت:﴿ وَٱلسَّمَآءِ ذَاتِ ٱلرَّجۡعِ ﴾ الطارق(١١). واتە: (سوێند بە ئاسمانێک کە خاوەنی گێڕانەوەیە)...... ئەوەش ئەوە دەگەیەنێت کەوا هەموو شتێک هەرچەند بەرز بێت بۆ زەوی دەگەڕێتەوە.... هەڵم بەرز دەبێتەوە پاشان دەبێت بە باران و دێتە خوارەوە. تەنەکان هەرچەند بەرز ببنەوە بەهۆی کێشی زەوییەوە بەرەو زەوی ڕادەکێشرێنەوە، هەروەها شەپۆلەکانی بێ تەل بەرەو زەوی دەشکێنەوە لە چینی ئایۆنۆسفیردا..... تیشکی گەرمی ژێر سوور بە هەمان ڕێڕەوی خۆیدا دەشکێتەوە بە شەو زەوی گەرم دەکات.

هەروەها ئاسمانیش چۆن ئەو تەنانە دەگەڕێنێتەوە بۆ زەوی، کاتێک لە زەوییەوە بۆی فڕێدەدرێت. بە هەمان کردار، هەر تەنێک لە جیهانی دەرەوەی زەوی بۆ فڕێبدرێت هەڵدەمژێت و پەرش و بڵاو دەکاتەوە و زەوی دەپارێزێت لە تیشکە بکوژەکانی گەردوون، وەک تیشکی ژێروەنەوشەیی بکوژ. ئاسمانەکان بەم شێوەیە وەکو سەقفێکی پارێزەرە بۆ زەوی ، خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ وَجَعَلۡنَا ٱلسَّمَآءَ سَقۡفٗا مَّحۡفُوظٗاۖ وَهُمۡ عَنۡ ءَايَٰتِهَا مُعۡرِضُونَ ﴾ الأنبياء (٣٢). واتە: (ئێمە ئاسمانمان کردووە بە سەقفێکی پارێزراو، کەچی ئەوانە ڕوو

وەردەگێڕن لە هەموو نیشانە و بەڵگەکانی ئاسمان). هەروەها دەفەرمووێت:
﴿ وَٱلسَّمَآءَ بَنَيْنَٰهَا بِأَيْيْدٍ وَإِنَّا لَمُوسِعُونَ ﴾ الذاريات(٤٧). واتە: (ئێمە ئاسمانمان بە دەستی قودرەتی خۆمان دروستکرد، بەردەوامیش گەورەی دەکەین و فراوانی دەکەین). ئەم ڕاستیەش ئێستا بە ناوی( هەلکێشانی گەردوون ) ناودەبرێت.
لە کۆندا وا زانرابوو کە کێش یان پێوەری گەردیلە ( مثقال ذرة ) بچووکترین شت و بچووکترین پێوەرە ، گەردیلە بەوە پێناسە کرابوو کە تاکەیەکی بنچینەیە و دابەش نابێت.
بەڵام کاتێك کە قورئان دابەزی باسی هەندێك تەن دەکات کە بچووکترن لە گەردیلە، یان گەردیلە دابەش دەبێت بۆ چەند وردیلەیەك. بەمەش قورئان یەکەم پەرتووکە باسی شتێك بکات بچووکتر لە گەردیلە:﴿ ...ٱلْغَيْبِ ۖ لَا يَعْزُبُ عَنْهُ مِثْقَالُ ذَرَّةٍ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَلَا فِى ٱلْأَرْضِ وَلَآ أَصْغَرُ مِن ذَٰلِكَ وَلَآ أَكْبَرُ إِلَّا فِى كِتَٰبٍ مُّبِينٍ ﴾ سبأ(٣). واتە: (...چونکە ئەو زاتە زانایە بە نهێنی و شاراوەکان، ئەندازەی کێشی گەردیلەیەك لە ئاسمانەکان و زەویدا لە خوا وون نابێت، هەروەها لەویش بچوکتر یان گەورەتر نییە کە لە کتێبی تایبەتی ڕوون و ئاشکرادا لە ـ لوح المحفوظ ـ دا تۆمار نەکرابێت).... .ئەمانە هەموویان ڕاستی دۆزراوەن لەسەر ڕاستییە سەرنجراکێشەکانی خرپی و هێلکەیی زەوی و سروشتی ئاسمانەکان و گەردیلەکان.
لەسەردەمی دابەزینی قورئاندا ئەم ڕاستییە زانستیانە هەتا لەسەر خەیاڵی مرۆڤی ژیر و شێتی ئەو کاتدا نەدەهات. زانستی قورئان لەبارەی چۆنیەتی دروستبوونی مرۆڤ و شێوازی باسکردنی دڵۆپە ئاوی تۆوی مرۆڤ کە لە توانای

دایـە هـەلگرتنی سـیفەتەکان و جـۆری کۆرپەلـە دیـاری بکـات:﴿ وَأَنَّهُۥ خَلَقَ ٱلزَّوْجَيْنِ ٱلذَّكَرَ وَٱلْأُنثَىٰ مِن نُّطْفَةٍ إِذَا تُمْنَىٰ ﴾ النجم(٤٥-٤٦). واتـە: ( هـەر ئـەو زاتـەش دوو جـۆری دروسـتکردووە کـە نێـر و مێیـە، لـە نوتفەیـەك ( لـە خـاڵێکی زۆر بچووك، ئـەویش ئەگـەر ویـستی خـوای لەسـەر بێـت) کاتێـك لـە جێـی خۆیـدا دادەنرێـت)...... ئەمـە راسـتییەکی زیندەوەرزانییـە ، نـەزانراوبوو تـەنها لـەم سـەردەمە نـەبێت...... ئێـستا ئێمـە دەڵـێین سـەری دڵۆپـە تۆوەکەیـە توانـای هــەلگرتنی هۆکــاری دیــارکردنی جــۆری توخمەکەیــە، واتــە ( sex determination factor). هـەروەها چـۆنیەتی دروسـتکردنی پەنجـەی گـەورەی دەسـتی مـرۆڤ بـەو نەخـشە ئـاڵۆزەی کـە خـودای گـەورە لـە بـواری پـشتڕاستکردنەوەی زیندووبوونـەوەی مـرۆڤ و جەسـتەکەی لـە رۆژی دواییـدا بـــــــەکاردەهێنێت:﴿ أَيَحْسَبُ ٱلْإِنسَٰنُ أَلَّن نَّجْمَعَ عِظَامَهُۥ بَلَىٰ قَٰدِرِينَ عَلَىٰٓ أَن نُّسَوِّىَ بَنَانَهُۥ ﴾ القیامە(٣-٤). واتە: (ئایا ئینسان وا دەزانێت هەرگیز ئێسکەکانی کۆناکەینەوە؟، بـەڵێ، لـەوە زیـاتریش دەکـەین و توانامـان هەیـە کـە نەخـشە وردەکـانی سـەر پەنجەکانی بەدی بهێنینەوە).....لێرەدا ئیعجازێك هەیـە لـە پەنجـەی گـەورەی مرۆڤ، ئەویش ئەوەیە کە هیچ یەکێکیان بە ئەوی تر ناچێت......

لــە قورئــانی پــیرۆزدا لاوازتــرین و بــێ هێزتــرین خــانوو، خــانووی جاڵجاڵۆکەیە...... خودای گەورە ناڵێت تۆڕی جاڵجاڵۆکە بەڵکو دەڵێـت خـانووی جاڵجاڵۆکە ، چونکە تۆڕی جاڵجاڵۆکە هەروەك دۆزراوەتەوە بەهێزترین تـۆڕە ، هێـزی چـوار ئەوەنـدەی تـەلی ئاسـنە کـە هـەمان بـاریکی هـەبێت، کەواتـە لاوازیەکە لە خانووەکەیە نەك لە تۆڕەکە . چونکە ماڵەکە ناخۆشترین خـانوو

و ئاوەدانییە بۆ ئەو کەسەی کە دەچێتە ناوی، بەڵکو تەڵێکە بۆ گرتنی ئەو شتانەی بەرەو ئەو دەچن و دەبێتە کوشتارگە بۆیان. جاڵجاڵۆکەی مێینە پاش ئەنجامدانی کرداری جووتبوون نێرینەکەی دەخوات ، هەروەها منداڵەکانیش یەکتر دەخۆن، کەواتە خانووی جاڵجاڵۆکە باشترین نموونەیە لەسەر ماڵێکی وێران و بێ چارەنووس ، حاڵی ئەو کابرایەش وا دەبێت کاتێك پەنا بۆ غەیری خودا دەبات . هەر بۆیە ڕەوانبێژی ئایەتەکە لێرەدایە: ﴿ مَثَلُ ٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَوْلِيَآءَ كَمَثَلِ ٱلْعَنكَبُوتِ ٱتَّخَذَتْ بَيْتًاۖ وَإِنَّ أَوْهَنَ ٱلْبُيُوتِ لَبَيْتُ ٱلْعَنكَبُوتِۖ لَوْ كَانُواْ يَعْلَمُونَ ﴾ العنكبوت(٤١). واتە: (نموونەی ئەوانەی جگە لە خوای گەورە، کەسانێکی تر دەکەنە پشتیوانی خۆیان، وەك نموونەی جاڵجاڵۆکەیەك وایە کە ماڵێکی بۆ خۆی ساز کردبێت، بە ڕاستی لاوازترینی هەموو ماڵەکان؛ ماڵی جاڵجاڵۆکەیە ئەگەر سەرنجتان بدایە و تێبگەیشتنایە)...... هەر لە کۆتایی ئەم ئایەتەشدا هاتووە: (لَوْ كَانُواْ يَعْلَمُونَ )، کە ئەویش ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە زانینی ئەم ڕاستییە نەزانراوە، تەنها لەم دواییەدا نەبێت ، ئەم نهێنیانە لە بارەی گیانەوەرانەوە نەدۆزراونەتەوە تەنها لەم دواییەدا نەبێت.

دیسان دەبینین لە سورەتی الكهف خودای گەورە دەفەرموویت:﴿ وَلَبِثُواْ فِي كَهْفِهِمْ ثَلَٰثَ مِاْئَةٍ سِنِينَ وَٱزْدَادُواْ تِسْعًا ﴾ الكهف(٢٥)....لەم سەردەمەدا ئێمە زانیمان کە (٣٠٩) ڕۆژی ساڵی قەمەری دەکاتە (٣٠٠) ڕۆژی ساڵی شەمسی بە ڕۆژ و خولەك و چرکە.

له سورەتی مـریەم خـودای گـەورە باسی مریەمـی دایکـی عیـسا ( د.خ ) دەکـات و پێی دەڵێت کاتێك وادەی لە دایكبوونی هات ، بڕواتە ژێر سێبەری دارخورماوە ، لـەوێ هەنـدێك خورمـا بخـوات. خـودای گـەورە دەفـەرموێت:﴿ فَأَجَآءَهَا ٱلْمَخَاضُ إِلَىٰ جِذْعِ ٱلنَّخْلَةِ قَالَتْ يَٰلَيْتَنِى مِتُّ قَبْلَ هَٰذَا وَكُنتُ نَسْيًا مَّنسِيًّا فَنَادَىٰهَا مِن تَحْتِهَآ أَلَّا تَحْزَنِى قَدْ جَعَلَ رَبُّكِ تَحْتَكِ سَرِيًّا ﴾ مـــــــریەم(٢٣-٢٤)..... نـــــوێترین لێكۆڵینـەوەی زانـستی لـەبارەی خورمـاوە پێمـان دەڵێـت: ماددەیـەك هەیـە لـە خورمـادا یارمـەتی كـرداری لـەدایكبوون دەدات، چونكە ماددەكـە منداڵدانەكـە دەنێتەوە یـەك.... هـەروەها ڕێگـرە لـە خـوێن بـەربوون، ماددەكـە پێـی دەڵـێن (oxgtocin)، كـە ماددەیـەكی نەرمـە ، وەك زانـراوە كـە مـاددە گیاییـەكان یارمەتیدەرن بۆ ئاسانكردنی كرداری لە دایكبوون و خاوێنكردنـەوەی قوولۆن.

كەواتە بەكارهێنانی خورما لەم كاتەدا وردەكارییەكی زانستی ڕوونی تێدایە.

ئەم نموونە زانستیانە هەموویان بەڵگەن لەسەر ڕاستی و دروستی و ڕاستگۆیی قورئـانی پیرۆز ، لەبەرئـەوە خـودای گـەورە دەفـەرموێت:﴿ لَّا يَأْتِيهِ ٱلْبَٰطِلُ مِنۢ بَيْنِ يَدَيْهِ وَلَا مِنْ خَلْفِهِۦ تَنزِيلٌ مِّنْ حَكِيمٍ حَمِيدٍ ﴾ فـصلت(٤٢). واتـە: (هـیچ ناحەقی و نادروستی و ناتەواوییەك ڕووی تێناكات لە هیچ كاتێكدا و لـە هـیچ لایەكـەوە ڕەوانـەكراو و نێـردراوی زاتێكـە كـە خـاوەنی حیكمـەت و داناییـە و شایانی سوپاس و ستایشە)... هەروەها دەفەرموێت:﴿ أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ ٱلْقُرْءَانَ وَلَوْ كَانَ مِنْ عِندِ غَيْرِ ٱللَّهِ لَوَجَدُوا۟ فِيهِ ٱخْتِلَٰفًا كَثِيرًا ﴾ النـساء(٨٢). واتـە: (ئـەوە بـۆ ئەوانە سەرنجی قورئان نادەن و لێكی نادەنەوە و لێی وردنابنـەوە؟ خـۆ ئەگـەر

له لایەن کەسێکی ترەوە بوایە جگە لە خوا بێگومـان جیـاوازی و دژایەتیـەکی زۆریان تێدا دەدۆزیەوە).
جیاوازی لە نێوان ئایەتەکان و دژایەتی لە نێوانیان هەروەها دژایەتی لە نێوان ڕاستییە جێگیرەکان، کە ڕۆژ بە ڕۆژ دەدۆزرێنەوە. چونکە ئەم جۆرە جیـاوازی و دژایەتییـە لـە نووسـراوەکان بـەدی دەکرێـت . هـەر لەبـەر ئەمـەش کـابرای نووسەر دێت هەر جارە دەستکاری نووسراوەکەی دەکات و چاپێکی نـوێ بـڵاو دەکاتـەوە... هـەر بـەم شـێوەیە دەبیـنین بیردۆز لـەدوای بـیردۆز دێـت، ئـەوەی پێش خۆی بە درۆ دەخاتەوە .....
کەچـی ئـەم کـەم وکورتیانـە لـە قورئانـدا بـوونی نییـە ، بـەڵکو هـەمووی موعجیزەیە ، چونکە باسی ڕابردوویـەك دەکات نەنووسـراوە. هـەروەها باسـی داهاتوویەك دەکات کە هێشتا نەدۆزراوەتەوە.
بۆچوونەکانی قورئـانی پـیرۆز لەبارەی داهـاتوو هـەموویان ڕاست دەرچـوون .
لـەبارەی سـەرکەوتنی ڕۆمـەکان پـاش شکـستهێنانیان دەڵێـت:﴿ غُلِبَتِ ٱلرُّومُ فِىٓ أَدۡنَى ٱلۡأَرۡضِ وَهُم مِّنۢ بَعۡدِ غَلَبِهِمۡ سَيَغۡلِبُونَ فِى بِضۡعِ سِنِينَۗ لِلَّهِ ٱلۡأَمۡرُ مِن قَبۡلُ وَمِنۢ بَعۡدُۚ وَيَوۡمَئِذٖ يَفۡرَحُ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ﴾ الـروم(٢-٤).واتـە: (ڕۆمـەکان تێکشکێنران، لە نزیکترین و نـزمترین وڵاتیانـدا، بـەڵام لـە ئاییـندەدا ڕۆمـەکان دوای شکـستیان سـەردەکەوتنەوە، لـە چـەند سـاڵێکدا ، هـەموو کـار و فرمانێـك تەنها بەدەست خوایە، لەوەو پێش و لەوە و دوایـش، جا ئـەو ڕۆژە ئیمانـداران خۆشحاڵ و شـاد دەبـن).... وشـەی (بـضع ) لـە زمـانی عـەرەبیـدا بـۆ ماوەیـەك

بەکاردێت کە لەنێوان (٣ — ٩) ساڵدایە، دەرئەنجامیش هەر وایوو. ڕۆمەکان پاش دوو ساڵ لە شکستەکە، بەسەر فارسەکاندا سەرکەوتن.

هەروەها لە سورەتی القمر باسی سەرکەوتنی موسڵمانان دەکات لە شەڕی بەدر:﴿ سَيُهۡزَمُ ٱلۡجَمۡعُ وَيُوَلُّونَ ٱلدُّبُرَ ﴾ القمر(٤٥). واتە: (لە ئاییندەیەکی نزیکدا لەشکر و کۆمەڵیان شکست دەهێنێت و هەڵدێن).

لە سورەتی الفتح باسی گەڕانەوە و چوونە ناو شاری مەککە دەکات: ﴿ لَّقَدۡ صَدَقَ ٱللَّهُ رَسُولَهُ ٱلرُّءۡيَا بِٱلۡحَقِّۖ لَتَدۡخُلُنَّ ٱلۡمَسۡجِدَ ٱلۡحَرَامَ إِن شَآءَ ٱللَّهُ ءَامِنِينَ مُحَلِّقِينَ رُءُوسَكُمۡ وَمُقَصِّرِينَ لَا تَخَافُونَۖ فَعَلِمَ مَا لَمۡ تَعۡلَمُواْ فَجَعَلَ مِن دُونِ ذَٰلِكَ فَتۡحٗا قَرِيبًا ﴾ الفتح(٢٧). واتە: (سوێند بە خوا بێگومان خوا خەونی پێغەمبەرکەی بە ڕاستی و وەك خۆی هێناوەتەدی کە دەفەرموێت: بەم زووانە ئێوە بە هەموو ئارامی و ئاسوودەییەکەوە بە ویستی خوا دەچنە ناو کەعبەی پیرۆزەوە، سەرتان دەتاشن یان کورتی دەکەنەوە بێ ئەوەی ترس و بیمتان لە کەس هەبێت، جا ئەوەی نەتانزانیوە خوا دەیزانی، کە جگە لەم سەرکەوتنە سەرکەوتنێکی نزیکی تری بۆ بڕیار داون و پێتان دەبەخشێت).

ئەمانە هەموویان بە ڕاستی چۆن بڕیار درابوو ئاواش ڕوویدا.... بە بەردەوامی شاراوەکانی قورئانی پیرۆز لەبەر چاومان دەبنە ڕووداوی ڕاستەقینە ، ئیبراهیم پێغەمبەر (د.خ) لە سەردەمی خۆیدا دوعا بۆ شاری مەککە دەکات:﴿ رَّبَّنَآ إِنِّيٓ أَسۡكَنتُ مِن ذُرِّيَّتِي بِوَادٍ غَيۡرِ ذِي زَرۡعٍ عِندَ بَيۡتِكَ ٱلۡمُحَرَّمِ رَبَّنَا لِيُقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ فَٱجۡعَلۡ أَفۡـِٔدَةٗ مِّنَ ٱلنَّاسِ تَهۡوِيٓ إِلَيۡهِمۡ وَٱرۡزُقۡهُم مِّنَ ٱلثَّمَرَٰتِ

﴿لَعَلَّهُمْ يَشْكُرُونَ﴾ ابراهيم(٣٧). واته: (پەروەردگارا بەڕاستی من هەندێ لە وەچە خێزانم لە دۆڵێكی وشكی بێ كشتوكاڵدا جێنیشین كردووە؛ لە پاڵ ماڵە پیرۆزەكەتدا، لە پاڵ ( بیت الحرام)دا، پەروەردگارا، بۆیە لێرە نیشتەجێم كردن تا بە چاكی نوێژ و خواپەرستی ئەنجام بدەن، جا داواكارم دڵی هەندێك لەو خەڵكە كەمەندكێش بكەیت بۆ لایان و لە ڕزق و ڕۆزی جۆراوجۆر بەهرەمەندیان بكەیت، بۆ ئەوەی سوپاسگوزاری بكەن)..... دوعای بۆ ئەم دۆڵە وشكە كرد. پاشان دەبینین تا ئەم سەردەمەش شوێنەكە ئارامە و خەڵكەكە لە ژیانێكی پڕ خوشی و ئارامیدا دەژین. ساڵانە سوودێكی زۆر لە كاروانی حاجیەكان وەردەگرن.

پاشان خودای گەورە پێیان دەفەرمووێت:﴿ ....وَإِنْ خِفْتُمْ عَيْلَةً فَسَوْفَ يُغْنِيكُمُ اللَّهُ مِن فَضْلِهِ إِن شَاءَ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴾

التوبە(٢٨).واتە:(خۆ ئەگەر دەترسن لە هەژاری و نەداری و بێ بازاڕی ئەوە بزانن كە لە ئاییندەدا خوای گەورە لە فەزڵ و بەخشندەیی خۆی دەوڵەمەندتان دەكات هەر كاتێك بییەوێت، بە ڕاستی خوا زانا و دانایە...)... هەر ئەوەش ڕوویدا ، دەبینین ئێستا بیرە نەوتەكان لە بیابانێكی وشكدا هەڵقوڵاون و ڕۆژ بە ڕۆژ نرخی ئەم نەوتە بەرز دەبێتەوە..... لەگەڵ ئەوەشدا ئەم بیابانە زۆر كانزایی گران بەها لەخۆ دەگرێت وەكو یۆرانیوم و هی تر. تا كۆتایی زەمان سوودی لێ وەردەگرن.

دیسان قورئانی پیرۆز باسی جیهانی جنۆكە و فریشتەكان دەكات، كە تا ئێستا ئەم نهێنییە بۆ كەس ئاشكرا نەكراوە، تەنها كەسانێكی كەم نەبێت ، ئەوانەی

خاوەنی بەهرە و تایبەتمەندی خودایین. ئەگەر بۆیان ئاشکرا ببێت تەنها بەپێی ئاماژە و نهێنیەکانی قورئان دەبێت.

هەروەها قورئان باسی سیاسەت و ڕەوشت و بەڕێوەبردن و شەڕ و ئاشتی، ئابووری و کۆمەڵگا ، خێزان و چۆنیەتی پێکەوە ژیانی ژن و پیاو دەکات، هەروەها یاسایان بۆ دادەنێت . کە یاسایەکن زۆر لە پێش یاساکانی مافی مرۆڤەوە دانراون. بە شێوازێکی تایبەت و تاکڕەوانە ، دەستەواژەی جوان و جێگیر لە ڕووی ڕەوانبێژی و زمانەوانیدا.

پرسیار لە ئیبن عەرەبی کرا لەبارەی ئیعجازی قورئانەوە، بە یەك وشە وەڵامی داوە و گۆتی: ڕاستییەکی ڕەها( مطلق ) یە، وشەکانی قورئان ڕاستن ، ڕاستیەیکی ڕەها( مطلق )، لە بەرامبەردا نووسەر بە هەموو هەوڵ و تەقەلای خۆی ناگاتە ئاستێکی بەرز، بەڵکو ڕێژەیی و ڕادەیی دەبێت...... دەگاتە ئاستی ڕاستگۆیی بە بینینی ئەو( خۆی ). مەودای بینینیش هەردەم لەسەردەمێکەوە بۆ سەردەمێکی تر چوارچێوە کراوە و گۆڕاوە. هەر یەکێك لە ئێمە لایەنێکی ڕاستی دەزانین، ئەوی تر نازانین. بەلایەکەوە تێڕوانینی هەیە لایەنەکانی تر لە دەست دەدات...... کەواتە ڕاستییەکان هەرچەندە بەدەستەوە بێت ڕاستی ڕێژەیین...... تەنها خاوەنی زانستی تەواو و بینینی گشتگیر هەر خودای گەورەیە و تاك و تەنیایە........ هەر خۆی خاوەنی ڕاستی و ڕەهاییە، بۆیە بە قورئان دەڵێین وشەی خودا ، چونکە قسەکانی هەمووی ڕاستن لە هەموو ڕوویێکەوە .

پرسیار لە پێغەمبەر محەمەد (دروودی خودا لەسەر بێت) کرا لەبارەی قورئانەوە کە چییە ، ئەو گوتی: (لەناو قورئاندا باسی خەڵکانی پێش ئێوەی

تێدایە ، پێداویستی و ناوبژیوانی ئێوەیە ، چاك و سوودبەخشە بۆ ئەوانەی لە دوای ئێوەدا دێن ، ئەو ڕاست و لێك گەرەوەیە، نەك گاڵتەجارییە ، ئەو بیرگەرەوەی ڕاستە و ڕەوایە . ئەو بەستراوی توندی خودایە . ئەو ڕێگای ڕاستە ، هەر کەسێك ئەم قورئانە پشتگوێ بخات لەناودەچێت، هەروەها ئەو کەسەی بەدوای ڕاستیەکاندا بگەڕێت بێجگە لە قورئان ، گومڕا دەبێت. تەنها قورئانە زمان پێ لاسار نابێت ، دڵ پێ تاریك نابێت ، هەرچەندە شێوازی وەڵامی زۆرە ، بەڵام هیچیان بێ سەنگ نییە، هەروەها قورئانە زاناکان لێی تێر نابن و شتە سەرسوڕمانەکانی تەواو نابن).

لەبارەی تەقینەوەی ڕۆژ و کۆتایی هاتنی ژیان لەسەر ئەم زەوییە و هاتنی ڕۆژی دوایی؛ خودای گەورە لە سورەتی الرحمن دەفەرموێت:﴿ فَإِذَا ٱنشَقَّتِ ٱلسَّمَآءُ فَكَانَتۡ وَرۡدَةٗ كَٱلدِّهَانِ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴾ الرحمن(٣٧-٣٨).. واتە: (کاتێك دێت ئاسمان لەت دەبێت و وەکو گوڵێکی سوور دێتە بەرچاو، یاخود وەك ڕۆنی قرچاوی لێ دێت، جا ئیتر ئەی گرۆی ئادەمیزاد و پەری بەکام لە ناز و نیعمەتەکانی پەروەردگار بڕوا ناکەن، کامەی پەسەند ناکەن ...).... ئەم سەردەمە گەردوون ناسەکان ، واتە پاش (١٤٠٠) ساڵ لە هاتنە خوارەوەی قورئان ، پێمان دەڵێن کە ئەم ئاسمانە بە ئەستێرەکانی ڕەنگا و ڕەنگی جوان ڕازاوەتەوە.

کاتێك تەقینەوە ڕوودەدات بە هەندێك ئەستێرە دەوترێت (Rossetta) واتە گوڵ ، ئایا لە چ سەرچاوەیەکەوە ئەم ڕاستییە پێش (١٤٠٠) ساڵ بە پێغەمبەر گەیێنراوە ؟!

بـۆ زانینـی ئـەم ڕاسـتیانە لـەبارەی تەقینـەوەی ئاسمانـەکان بگەڕێنـەوە بـۆ ئەنتـەرنێت ماڵپـەڕی Nasa بەشـی ( Astronomical Picture of the day ) بـە ناونیـشانی: ( cats exe ) . تـا بـزانن ئەمـە قـسەی زاناکانـە ، هەروەها ئەوەش قسەی قورئانە...... لەبەر ئەم هەموو بەڵگانە ئێمـە نـاتوانین بڵێین ئەم کتێبە لە نووسراوی مرۆڤەکانە.

# بەشی سیانزەهەم

## - گــــومانەکـــان

هاوڕێیەکەم گوتی: تۆ دەڵێی لە قورئاندا شتی پێچەوانە و دژبە یەکتر نییە ، باشە وەڵامت چییە بۆ ئەم ئایەتە:﴿ وَقُلِ ٱلۡحَقُّ مِن رَّبِّكُمۡۖ فَمَن شَآءَ فَلۡيُؤۡمِن وَمَن شَآءَ ..... ﴾ الكهف(٢٩). واتە: (پێیان بڵێ: حەق هەر ئەوەیە کە لەلایەن پەروەردگارتانەوە بۆتان ڕەوانەکراوە، جا ئەوەی دەیەوێت با باوەڕ بهێنێت و ئەوەی دەیەوێت با کافر بێت....).... لەگەڵ ئەم ئایەتە:﴿ وَمَا تَشَآءُونَ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيمًا حَكِيمًا ﴾ الإنسان(٣٠). واتە: (دڵنیاش بن: ئێوە هیچتان پێناکرێت و هیچ کارێکتان پێ ئەنجام نادرێت مەگەر خوا ویستی لەسەر بێت، بێگومان ئەو خوایە زانا و دانایە دەزانێت کێ شایستەی هیدایەتە، داناشە لە هیدایەتدانی بەندە چاکەکاندا)... هەروەها لە قورئاندا

هـــــاتووه:﴿ وَجَعَلُوا۟ ٱلْمَلَـٰٓئِكَةَ ٱلَّذِينَ هُمْ عِبَـٰدُ ٱلرَّحْمَـٰنِ إِنَـٰثًا ۚ أَشَهِدُوا۟ خَلْقَهُمْ ۚ سَتُكْتَبُ شَهَـٰدَتُهُمْ وَيُسْـَٔلُونَ ﴾ الزخـــرف(١٩). واتـــه: (ئـــهو خوانەناســـانە فریشتەکان کە بەندەی خوای میهرەبانن، بە کچی خوایان دەدایە قەڵەم!! ئایا ئەوان ئامادەی دروستکردنیان بوون؟! لە ئاییندەدا ئەم بوختانەیان لەسەر دەنووسرێت و پرسیاریان لێ دەکرێت). هەروەها دەفەرمووێت:﴿ وَإِنَّهُۥ لَذِكْرٌ لَّكَ وَلِقَوْمِكَ ۖ وَسَوْفَ تُسْـَٔلُونَ ﴾ الزخـــرف(٤٤).. واتـــه:(بـــه ڕاستی ئـــەم قورئانـــە یادخەرەوەیە بۆ خۆت و بۆ قەومەکەت، لە ئاییندەشدا پرسیارتان لێدەکرێت لەبارەی )....

دەبینین لە شوێنێکی تر دەفەرمووێت:﴿ ...وَلَا يُسْـَٔلُ عَن ذُنُوبِهِمُ ٱلْمُجْرِمُونَ ﴾ القـصص(٧٨). واتـــه: (تاوانبـــاران پرســـیاریان لێناکرێـــت دەربـــارەی گوناهەکانیان)....... کە لە ڕۆژی دواییدا بە سەر و چاویان دەناسرێنەوە ، لەوکاتە:﴿ يُعْرَفُ ٱلْمُجْرِمُونَ بِسِيمَـٰهُمْ فَيُؤْخَذُ بِٱلنَّوَٰصِى وَٱلْأَقْدَامِ ﴾ الرحمن(٤١).. واتە: (ئینجا تاوانکار و گوناهباران بە ڕووخساریاندا دەناسرێنەوە، ئەوسا دەستگیر دەکرێـت لـە ناوچـەوانیان و قاچـیان و گلۆلیـان دەکـەن و فـڕێ دەدرێنـە دۆزەخەوە...).... هـەر قورئـانیش دەڵێت:﴿ وَلَا يُوثِقُ وَثَاقَهُۥٓ أَحَدٌ ﴾ الفجـر:(٢٦). واتە: (کەسیش وەکو ئەو زاتە ( بێبـاوەڕان) نابەستێتەوە و بەنـدیان ناکـات). واتە هەر یەکێك بەسە بۆ سزادانی خۆی . لە شوێنێکی تر دەفـــەرمووێت: ﴿ ٱقْرَأْ كِتَـٰبَكَ كَفَىٰ بِنَفْسِكَ ٱلْيَوْمَ عَلَيْكَ حَسِيبًا ﴾ الإســـراء(١٤).. واتـه: (دەی نامـەی کردەوەکانت بخوێنەرەوە و تەماشای بکە، ئەمڕۆ هەر خۆت بڕیار بدە و حساب

بۆ خۆت بکە)... لە شوێنێکی تر دەڵێت: ﴿ ثُمَّ فِي سِلْسِلَةٍ ذَرْعُهَا سَبْعُونَ ذِرَاعًا فَاسْلُكُوهُ ﴾ الحاقە(٣٢)..واتە: (پاشان بە زنجیرێکی حەفتا گەزی بیبوستنەوە).

منیش گوتم: ئەمانە هیچیان پێچەوانە و دژبە یەکتر نین . با هەردووکمان پێکەوە دەربارەیان بیربکەینەوە ، کاتێك دەڵێت ئەوەی حەزی لێیە با بڕوا بهێنێت، ئەوەی حەزی لێنییە با بڕوا نەهێنێت. ئەمە زۆر بەڕوونی ئاماژەیە بۆ سەربەستی بەندە و مرۆڤ ، ئەم سەربەستییە بە زۆری وەرمانەنەگرتووە لە خودای گەورە. بەڵکو خودای گەورە بە ویستی خۆی بە مرۆڤی بەخشیوە. بەڵام کاتێك لە ئایەتی دووەم دەڵێت ئێوە هیچتان پێناکرێت تەنها بە حەز و ویستی خودا نەبێت. ئەمە ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە سەربەستی مرۆڤ لە چوارچێوەی حەز و ئارەزووی خودا دەرناچێت نەك دژیەتی ، واتە سەربەستی بەندەکان لەوانەیە بەپێچەوانەی ڕەزامەندی خودا بێت تاوان هەڵبژێرێت و گوناه بکات، بەڵام لە حەز و ویستی ئەو دەرناچێت ، هەردەم لە حەزی ئەودایە. یا لە ڕەزامەندی ئەو دەربچێت کە ئەمەش خاڵێکی ورد و گرنگە. کەواتە ملکەچبوونی مرۆڤەکان هەر هەمان سەربەستبوونە، چونکە خودای گەورە بەپێی نیاز و دڵی بەندەکان شتیان بۆ هەڵدەبژێرێت. ئەمەش مانای وایە خودای گەورە ئەو شتەی بۆ مرۆڤەکان پێی باشە کە مرۆڤەکان بۆ خۆیان پێ باشە و بە حەز و دڵی خۆیانە ، بۆیە مرۆڤەکان ملکەچن بۆ ئەو شتەی کە هەڵیدەبژێرن. کەواتە هیچ زۆرە ملێ و ملکەچبوون و دژایەتییەك بوونی نییە...... ملکەچبوون هەمان سەربەستبوونە، کە ئەمەش بابەتێکی زۆر وردە لە تێگەیشتنی سەربەست و بەربەستی مرۆڤ ، ئەوەی کە تۆ پێی دەڵێی دژایەتی ، لە ڕاستیدا ڕوونکردنەوەیە بۆ ئەم نهێنییە.

ئـەو ئایەتانـەی باسـی سـزادان و لێپێـچینەوە دەکـەن ، هـەر ئایـەتێك باسـی کۆمەڵە کەسێك دەکات ، واتە هەنـدێك پرسیاریان لێ دەکرێـت و شایەتییان لێ وەردەگیرێت، هەندێکی تر گوناه و تاوانیان ئەوەنـدە زۆرە هـەموو شـوێنێکیان تاوانی پێوە دیارە ، ئەوانە بـە نێوچـەوان و پێیەکانـەوە دەبەسـترێنەوە و سـزا دەدرێن ، هەندێکیان دان بە تـاوانی خۆیـان نـاهێنن و سـزاکان ڕەت دەکەنـەوە، ئەوانە ئەندامانی لاشـەیان شـایەتیان لەسـەر دەدەن: ﴿ ٱلۡيَوۡمَ نَخۡتِمُ عَلَىٰٓ أَفۡوَٰهِهِمۡ وَتُكَلِّمُنَآ أَيۡدِيهِمۡ وَتَشۡهَدُ أَرۡجُلُهُم بِمَا كَانُواْ يَكۡسِبُونَ ﴾ یس(٦٥). واتە: (ئـەمڕۆ مـۆر دەنـێین بەدەمیانـدا و قـسەیان بـۆ ناکرێـت، بـەڵکو دەسـتیان قـسەمان بـۆ دەکات، قاچیشیان شایەتی دەدات بەو کار و کردەوانە کە ئەنجامیان دەدا).

هەندێکیـشیان خۆیـان دەبنـە چـاودێری خۆیـان ، پەشـیمان دەبنـەوە و ئـازاری خۆیـان دەدەن ، پەشـیمانی لەسـەر خۆیـان تونـد دەکـەن ، ئەوانـە کەسـیان لێپێـچینەوە و پرسـیاریان لێ ناکرێـت و شـایەتییان لەسـەر نادرێـت. لـە بەرامبەردا، کەسانێکی تاوانباری گـەورە هـەن. لـە ڕۆژی دواییـدا لـە بەرامبـەر خودای گەورە دەوەستن و سـوێند دەخـۆن و درۆ دەکـەن: ﴿ يَوۡمَ يَبۡعَثُهُمُ ٱللَّهُ جَمِيعٗا فَيَحۡلِفُونَ لَهُۥ كَمَا يَحۡلِفُونَ لَكُمۡ وَيَحۡسَبُونَ أَنَّهُمۡ عَلَىٰ شَيۡءٍۚ أَلَآ إِنَّهُمۡ هُمُ ٱلۡكَٰذِبُونَ ﴾ المجادله(١٨). واتە: (لەو ڕۆژەدا کە خـوا هـەموویان زینـدوو دەکاتـەوە، دەسـت دەکەنـەوە بـە سوێند خواردن هەروەك بۆ ئێوە سوێندیان دەخوارد، لە کاتێکدا وا دەزانـن کـە ڕزگاریان دەبێت و شـتێکیان دەسـت دەکـەوێت!! ئاگاداربن کـە بـە ڕاسـتی هـەر ئـەوان درۆزنـن )...... ئەوانـەن کـە لـە ڕۆژی دواییـدا لەسـەر سـەر و چـاویان

ڕادەکێشن و بە زنجیر دەبەسترێنەوە. ئەبو حامدی غەزالی دەڵێت: ئەم زنجیرە بریتییە لە زنجیرەی هۆکارەکان.

- باشە ڕات چییە لەبارەی زانستی خودا، کاتێك دەڵێت: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ عِندَهُۥ عِلۡمُ ٱلسَّاعَةِ وَيُنَزِّلُ ٱلۡغَيۡثَ وَيَعۡلَمُ مَا فِي ٱلۡأَرۡحَامِۖ وَمَا تَدۡرِي نَفۡسٞ مَّاذَا تَكۡسِبُ غَدٗاۖ وَمَا تَدۡرِي نَفۡسُۢ بِأَيِّ أَرۡضٖ تَمُوتُۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرُۢ ﴾ لقمان(٣٤). .....هەروەها لە قورئاندا هاتووە کە خودای گەورە ئەم زانستە تایبەتمەند کراوە بە خۆی ، واتە کەس هیچی لێنازانێت بێجگە لە ئەو:﴿ وَعِندَهُۥ مَفَاتِحُ ٱلۡغَيۡبِ لَا يَعۡلَمُهَآ إِلَّا هُوَۚ .... ﴾ الانعام(٥٩). .. باشە ئەگەر وابێت تۆ چی دەڵێی کاتێك پزیشکێك دەتوانێت بزانێت چی لەناو منداڵداندا هەیە و ، دەتوانێت بزانێت ئایا نێرە یان مێیە ؟..... تۆ چی دەڵێی بۆ ئەو زانایانە کە توانییان بە هەندێك کرداری کیمیایی بارانی دروستکراو بیارێنن ؟

- دەڵێم: قورئان باسی هێنانە خوارەوەی باران ناکات، بەڵکو باسی هێنانەخوارەوەی (الغیث ) دەکات ، واتە بارانێکی زۆر. کە ڕێژەیەکی زۆر دەبارێت . دەتوانێت چارەنووسی میللەتێك بگۆڕێت لە وشکی و نەبوونی بۆ زۆرئاوی و پڕ بەروبوومی...... بارانیش بەم ڕێژەیە ناکرێت بە تاقیکردنەوەیەك بهێنیتە خوارێ.

زانستی خودا بۆ ئەو کۆرپەلەیەی لە سکی دایکیدایە زانستێکی گشتییە لە هەموو ڕوویەکەوە. نەك تەنها زانستی دیارکردنی جۆری کۆرپەلە ، ئایا نێرە یان مێیە. بەڵکو دەزانێت لە کوێ بووە ، چۆن دەبێت ، لە دونیادا چی دەکات ، ڕۆژی لە دایکبوونی، ڕۆژی مردنی ، ئەم کارانە پزیشك ناتوانێت بزانێت.

- باشە کورسی خودا چییە و چۆنە ؟ کە ئێوە دەڵێن بە قەدەر ئاسمانەکان و زەوییە، هەشت لە فریشتەکان هەڵی دەگرن ؟!

- عەقڵی تۆ دەزانێت لەبارەی ئاسمانەکان و زەوی ، کە تۆ مرۆڤێکی بەرامبەر بە ئەوان هیچ بوونێکت نییە ، باشە بۆچی کورسی خودا بە قەدەریان نەبێت ، کە زەوی و رۆژ و ئەستێرەکان و رێرەوە ئاسمانییەکان هەموویان بە هێزی خودا لە بۆشاییدا دانراون.؟ کەواتە بۆچی لە هەلگرتنی عەرشی خودا سەرت سوڕدەمێنێت؟

- باشە کورسی و عەرش چین ؟!

- تۆ پێم بڵێ ئەلیکترۆن چییە؟ من پێت دەڵێم کورسی چییە ؟ پێم بلێ کارەبا چییە ، پێم بلێ هێزی کێشکردن چییە ؟ پێم بڵێ کات چییە ؟.. تۆ هەقیقەتی ئەم شتانە نازانی، تا پرسیاری کورسی و عەرشم لێ بکەی ؟....... ئەم جیهانە پڕە لە نهێنی ، ئەمەش دوو نهێنین لەم نهێنیانە.

- باشە چی دەڵێی لەبارەی ئەو مێرووڵەیەی کە لە قورئاندا باسی لێوە کراوە و لەگەڵ مێرووەکانی تربە قسە هاتووە و ئاگادار کردوونەتەوە لە هاتنی سلێمان پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێت) و لەشکرەکەی ؟ ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَآ أَتَوۡاْ عَلَىٰ وَادِ ٱلنَّمۡلِ قَالَتۡ نَمۡلَةٞ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّمۡلُ ٱدۡخُلُواْ مَسَٰكِنَكُمۡ لَا يَحۡطِمَنَّكُمۡ سُلَيۡمَٰنُ وَجُنُودُهُۥ وَهُمۡ لَا يَشۡعُرُونَ ﴾ النمل(١٨)....ئەگەر تۆ شتێکی کەمت خوێندباوە لەبارەی زانستی گیانەوەرانەوە ، ئەم جۆرە پرسیارانەت نەدەکرد...... زانستی زیندەوەرەکان لێکۆڵینەوەی زۆری کردووە لەبارەی زمانی مێرووله و زمانی هەنگەوە. کەواتە زمانی مێرووله لە ئێستادا بووە بە

ڕاستییەك، كە گومانی تێدا نییە....... باشە دەكرا مێرووولەكان یان هەنگەكان ئەم هەموو كارە ئالۆزانە ڕێكبخەن و لە نێوان خۆیاندا دابەشی بكەن بەبێ لێكتێگەیشتن، بۆ ئەم ژمارە زۆرە كە پێكەوە دەژین ؟ كەواتە جێگای سەرسوڕمان نییە ئەگەر مێرووولەیەك سلێمان پێغەمبەری ناسیبێت، باشە ئێمەش خودامان نەناسیوە ؟

- خودا چۆن شتەكان دەسڕێتەوە پاش نووسینیان لە تەختە پارێزراوەكەدا ( اللوح المحفوظ )، كاتێك دەفەرموێت: ﴿ يَمْحُوا۟ ٱللَّهُ مَا يَشَآءُ وَيُثْبِتُ ۖ وَعِندَهُۥٓ أُمُّ ٱلْكِتَـٰبِ ﴾ الرعد(٣٩). . ئایا خودای ئێوە هەڵە دەكات ، وەكو ئێمە كاتێك لە ژماردن هەڵە دەكەین، پاشان بە خۆمان شت ڕەش دەكەین و شتێكی تر دەنووسین...... یان با بڵێین ئایا خودای ئێوە بە خۆیدا دەچێتەوە، هەروەك ئێمە بە خۆماندا دەچینەوە ؟!.

- خودا شتە خراپەكان ڕەش دەكاتەوە بەهۆی هاندانی چاكە لە ناخماندا ، خودا لە قورئاندا دەفەرموێت: ﴿ ...إِنَّ ٱلْحَسَنَـٰتِ يُذْهِبْنَ ٱلسَّيِّـَٔاتِ ۚ ذَٰلِكَ ذِكْرَىٰ لِلذَّٰكِرِينَ ﴾ هود(١١٤). واتە: (... بەڕاستی كردەوە چاكەكان كردارە خراپەكان لادەبەن و گوناهەكان دەشۆنەوە، ئەوە ئامۆژگاری و بیرخەرەوەیە بۆ ئەوانەی یادی خوا دەكەن).

دەربارەی پیاو چاكەكان دەفەرموێت: ﴿ ...وَأَوْحَيْنَآ إِلَيْهِمْ فِعْلَ ٱلْخَيْرَٰتِ وَإِقَامَ ٱلصَّلَوٰةِ وَإِيتَآءَ ٱلزَّكَوٰةِ ۖ وَكَانُوا۟ لَنَا عَـٰبِدِينَ ﴾ الانبیاء(٧٣). واتە: (نیگامان بۆ كردن بە ئەنجامدانی كار و كردەوە چاكەكان و ڕاگرتنی نوێژ و

زەکـات دان، ئـەوان هـەر ئێمـەیان دەپەرسـت و هـەر بەندایـەتی ئێمـەیان دەکرد)...... بەم شێوەیە خودا خراپەکان دەسڕێتەوە بەبێ ئـەوەی بەڕاستی بسڕێتەوە ، ئەمەیە نهێنی ئەو دوو ئایەتە کە ئاماژەت بۆ کردبوو.

- ڕات چۆنە لەبارەی ئـەم ئایەتـە: ﴿ وَمَا خَلَقْتُ ٱلْجِنَّ وَٱلْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ ﴾ الذاریات(٥٦). واتە: ( بێگومان من پەری و ئادەمیزادم دروست نەکردووە تـەنها بۆ ئەوە نەبێت کە من بپەرستن و فەرمانبەردارم بن) ... ئایا خودا پێویستی بە عیبادەتی ئێمە هەیە ؟!

- نەخێر ، بەڵکو ئێمە پێویستمان بە عیبادەتی ئەو هەیە.

کاتێـك ئافرەتێکـت خۆشـدەوێ. ئایـا ئـەم خۆشەویـستییە ئەرکێکـە و لێـت داواکراوە ، یان تەنها چێژ لـەم جوانییـە وەردەگری و پێـی دڵخۆش دەبیت ؟ خوداش هەروایە ، جوانی ئەو، سەرەوەی هەموو جوانییەکە ، کاتێـك دەیناسی و هەست بە جوانی و توانـایی ئـەو دەکـەی ، پـەنا بـۆ عیبـادەتکردنی دەبـەی ، بەم عیبادەتـەش خۆشـی و ئـارامی دەچـێژی و هەسـت بـە چـالاکی و دڵخۆشـی دەکەی.

عیبـادەت لای ئێمــە تــەنها پەیوەســتە بــە ناســین و زانــستەوە..... خــودا ناپەرستڕێت تەنها بە زانین و ناسین نەبێت، ناسینی خوداش لووتکەی هەموو زانستەکانە، هەروەها کۆتایی گەڕانێکی زۆر دوور و درێژە بەدوای زانـستەکاندا ، ئەم زانینـە لـەکاتی لـە دایکبوونـەوە دەستـپێدەکات . یەکـەم شـت کـە منـداڵ دوای لە دایکبوونی دەزانێت ، هەردوو مەمکی دایکییە ، یەکـەم چێژە ، ئینجا دایکی دەناسێت. پاشان بـاوکی ، پاشان خێزانـی و کۆمـەڵگا و دەوروبـەری ، لە دواییدا هەوڵ دەدات ئەم دەوروبەرە بۆ سوودی خۆی بەکاربهێنێت، کە ئەویش

دەبێتە مەمكێكی تری گەورە ، بەهۆی ئەوەوە دەتوانێت دەوڵەمەندی و سەرمایەداری و پلە و پایە بۆ خۆی بەدەست بهێنێت. زێڕ و ئەلماس لە زەوی، مرواری لە دەریا دەربهێنێت . بەروبووم و سەوزە و میوە، کە ئەمەش چێژێکی ترە لە ئەنجامی گەڕان بەدوای زانستدا. پاشان لە قۆناغی گەڕان بەدوای زانست لە دەوروبەریدا . بەرەو ئاسمانەکان هەوڵدەدات و دەچێتە سەر مانگ ، مانگە دەستکردەکان بەرەو هەسارەی مەریخ و جیهانێکی نادیار ، بۆ ئەوەی چێژێکی تر وەربگرێت ، ئەویش چێژ وەرگرتنە لەم گەردوونە ، دوای ئەمانە بەخۆیدا دەچێتەوە و پرسیار لە خۆی دەکات، من کێم تا ئەوەندە شت بزانم..؟.... پاشان گەڕانێکی نوێ دەستپێدەکاتەوە لە زانستخوازی، گەڕانێك بەدوای خودی مرۆڤدا ، بۆ ئەوەی تواناکانی بزانێت و بەسەریدا زاڵبێت. لە بەرژەوەندی خۆی و خەڵکانی تردا بەکاری بهێنێت ، کە ئەمەش چێژێکی ترە. پاشان دەگاتە لووتکەی زانستخوازیەکە کاتێك خۆی دەناسێت و بەدوای ناسینی خودای خۆیدا دەگەڕێت. لەدوای تەواوبوونی لە ناسینی خودا، ئەم زنجیرە زانستخوازییە تەواو دەبێت. بەمەش دەگاتە کۆتا ئاست لە هەستکردن بە خۆشی. چونکە شاد دەبێت بە ناسینی و جوانی خودا، ئەو جوانییە سەرووی هەموو جوانییەکە ، ئەمەیە گەڕانی بەندە بەدوای عیبادەت و پەرستندا...... ڕێگایەکە هەمووی گوڵ و خۆشییە ئەگەر ڕێگای ژیان قورس و بە ماندووبوون بێت، لەبەرئەوەیە چونکە گوڵچنین دەبێت پەنجەکان تووشی خوێنبەربوون بکات بەهۆی هەبوونی دڕکەوە، هەروەها ئەوەشی بە تەمای خۆشی بێ کۆتایی بێت ، دەبێت خۆی بۆ ماندوو بکات. بەڵام کاتێك مرۆڤ دەگاتە قۆناغی ناسینی خودا و پەردەکان لەسەر چاوی لادەچێت؛ هەست بە

چێژێکی بێ کۆتا دەکات ، چێژێکە ئەگەر پاشاکان بزانن چۆنە یەکسەر شمشێر هەڵدەگرن شەڕ لە پێناویدا دەکەن..... ئەویش چێژی پەرستنی ڕاستەقینەیە....... ئەم چێژە بەشی مرۆڤی بەندەیە. خودای گەورە پێویستی بەم پەرستنە نییە ، بەڵکو پێویستی بە گێتی نییە بە گشتی ....... ئێمە بۆ ئەوە خودا ناپەرستین، چونکە داوامان لێکراوە ، بەڵکو بۆ ئەوە دەپەرستین، چونکە ئەو دەناسین و هەست بەجوانی و گەورەیی ئەو دەکەین..... ئێمە بەم پەرستنە سەنگمان کەم و سووك نابێت، بەڵکو سەربەست و سەربەرز دەبین، لە هەموو بەندایەتییەکانی دونیا.... . ڕزگار دەبین، لە حەز و ئارەزووەکان و تەماعکارییەکان و خۆشویستنی سەروەت و سامان. ڕزگار دەبین..... ئێمە لە خودا دەترسین و لە کەسی تر ناترسین، گوێڕایەڵی بۆ کەس ناکەین بێجگە لە خودا...... لە خودا دەترسین بەو پەڕی زیرەکایەتی...... پەرستنی ئەو سەربەستییە...... خۆ بەکەم زانین بەرامبەر بە خودا ڕێزداری و گەورەییە..... ناسینی ئەو دڵنیاییە...... ئەمە لە ڕاستیدا پەرستنە..... هەر ئێمە سوودمەندین و خۆشی دەچێژین..... خودا هەمیشە بێ نیازە و پێویستی بە هیچ شتێك نیە....... خودای گەورە ئێمەی دروست کرد بۆ ئەوەی پێمان ببەخشێ، نەك لێمان وەربگرێ....... دروستکراوین بۆ ئەوەی چاکە لەگەڵان بکات و بەخشراوەکان پێمان بدات. خۆی گوێ گرە و دەبینێ، گوێ و بینینمان پێ دەبەخشێ ، هەر خۆی زانا و بەئاگایە ، عەقڵی بە ئێمە بەخشیوە بۆ ئەوەی هەندێك لە زانستی خۆی پێمان بدات ، ئەندامەکانی هەستکردن پێمان بەخشراون بۆ ئەوەی شارەزایی خۆیمان پێ ببەخشێت، بۆ ئەوەی ببینە پیاوی خودا. لە ژێر سێبەری ئەو بڕیار بدەین و

کاری گەورە ئەنجام بدەین ، عیسا پێغەمبەر بەندەی خودا بوو ، بەڵام خودای گەورە توانای زیندووکردنەوەی مردووەکانی پێ بەخشی، لە قوڕ باڵندەی دروستکرد و پێ دەگوت زیندوو ببە ، یەکسەر زیندوو دەبوو ، چارەسەری نەخۆشی و کورمیی دەکرد بە ڕێپێدانی خودا.

کەواتە بەندایەتی بۆ خودا پێچەوانەی تێگەیشتنی ئێمەیە بۆ چەمکی بەندایەتی ، بەندایەتی بە تێگەیشتنی ئێمە ئەوەیە کە سەروەر دەبێت هەموو خێر و تواناکانی مرۆڤێکی بەندە بۆ خۆی ببات. بەڵام بەندایەتی بۆ خودا پێچەوانەی ئەمەیە ، سەروەرەکە خودایە شت بە بەندە دەبەخشێ کە سنووری بۆ نییە لە ناز و نیعمەتەکان ، هێزێکی زۆر لە سیفەتەکانی خۆی پێ دەبەخشێ لەو کاتە خودا دەفەرمووێت:﴿ وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ ﴾ الذاريات(٥٦). مانا شاراوەکەی ئەم ئایەتە پیرۆزە ئەوەیە کە خودای گەورە دەیەوێت خۆشەویستی و چاکە و ناز و نیعمەتیان پێ ببەخشێ، بەهۆی پەرستنی ئەوان بۆ من ، سەربەرزی و ئاسوودەیان دەکەم ، جلوبەرگی ڕێزداری و جێنشینی خودا دەکەمە بەریان .

خودای سەروەر پێویستی بە پەرستنی ئێمە نییە بۆ ئەو، ئێمە پێویستمان بەم پەرستن و پایە بەرزییە هەیە ، ئەو هەموو چاکە و بەخششە، کە کۆتایی نایەت.

خودای گەورە زۆر سەخی و بەخشندەیە، ڕێگامان پێدەدات لە هەموو کات و ساتێك لە دەرگای ئەو بدەین و بەبێ دیاری کردنی کات بچینە خزمەتی ئەو ، داوای لێ بکەین و لێی بپاڕێینەوە تا کۆتایی توانامان تەنها بەوەی کە پارچە پەڕوویەك دادەنێی و دەڵێی ( الله أكبر )، لە هەمان کاتدا لە بەردەم ئەو ئامادە

دەبی ، ئەو شتەی لێی داوا دەکەی کە حەزت لێیەتی....... ئایا ئەو پادشایە کێیە و لە کوێیە هەرکاتێك حەزمان لێبوو بەبێ مۆڵەت وەرگرتن بچین بۆ لای، ؟!

هەر لەبەر ئەمە بەندەی خودا (محەمەد متوەلی ئەلشعراوی)، خودا لێی ڕازی بێت لە پارچە هۆنراوەیەکدا ئەم بابەتە دەخاتە ڕوو و دەڵێت: گەورەیی بۆ من بەسە کاتێك من بەندەم...... خودا بەبێ مۆڵەت وەرگرتن پێشوازیم لێ دەکات. ئەو بەو هەموو گەورەییە ...... من دەتوانم بچمە بەردەم ئەو ، بەو کات و ساتەی من حەزم لێیەتی.

لە شوێنێکی تر دەڵێت: پێم بڵێن چ دروستکراوێك هەیە لە ڕۆژێکدا پێنج جار پێشانی دروستکەرەکەی دەدات (مەبەستی هەر پێنج نوێژە ). ئەمە هەندێك نموونەی شاراوەیی ئەم ئایەتە پیرۆزەیە کە بووە بە سەرچاوەی گومانت ﴿ وَمَا خَلَقْتُ ٱلْجِنَّ وَٱلْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ ﴾، ئەگەر بە وردی تێڕوانینی تێدا بکەی تەنها تووشی سەرسوڕمان و مەندەهۆشی دەبیت .

# بـــــــەشی چواردەهەم

## - هەڵوێستی ئایین لەبارەی پەرەسەندن ( التطور )

هاوڕێیەکەم گوتی: ئەمڕۆ یارت زۆر سەخت دەبێت . لەسەرتە بسەلمێنی کە دروستکردنی مرۆڤەکان بە چەند قۆناغێکدا تێپەڕیوە....... چونکە کاتێك ئێوە دەڵێن خودای دروستکەر پارچە قوڕێکی هێنا و کرا بە هەویر و بە دەستی خۆی پەیکەری ئادەمی لێ دروستکرد و پاشان فۆی تێکرد، بوو بە مرۆڤێکی زیندوو، ئەم قسەیە تەواو پێچەوانەی زانستی پەرەسەندنە. کاتێك دەڵێت: دروستبوونی ئادەم بە چەند قۆناغێکی پەرەسەندندا تێپەڕیوە لە جیهانی گیانلەبەرانی پێش خۆی، پەیوەندی ئەو لەگەڵ خێزانەکەی لە جیهانی گیانلەبەران بە هیچ شێوەیەك نەپچڕاوە، بەڵکو ئەو لەگەڵ مەیموونەکان ئامۆزای یەکترن ، لە نەوەیی حەوتەمدا بە یەك دەگەن ،

بەیەکچوونی تەواویش لە نێوان پارچە و پێکهاتەی لاشەیاندا هەیە ، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە هەموویان دەگەڕێنەوە بۆ یەك خێزان ؟!

من گوتم با خۆم ئامادە بکەم، ئێستا من لە شەڕێکی زانستی چەوردام. گوتم: لێم گەڕێ با زانیاریەکانت ڕاستبکەمەوە، یەکەم جار پێت دەڵێم خودای گەورە ئادەم بەم شێوازە سادەیە کە تۆ باسی دەکەی دروستی نەکردووە ، نەك ئەوە پارچە قوڕێکە فوی تێکە و دەبێت بە ئادەم...... بەڵکو قورئانی پیرۆز چیرۆکێکی تری جیاوازی هەیە ، چیرۆکێکە باسی دروستبوونی ئادەم دەکات کە بە چەند قۆناغێك تێپەڕیوە ، بە کاتێکی نادیار کە هەر خودا دەزانێت چەند بووە ، قورئان ناڵێت مرۆڤ ڕاستەوخۆ لە قوڕ دروستکراوە ، بەڵکو دەڵێت لە نەوە و بنچینەیەك کە لە قوڕەوە هاتووە:﴿ وَلَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَـٰنَ مِن سُلَـٰلَةٍ مِّن طِينٍ ﴾ المؤمنون(١٢). واتە: (سوێند بە خوا بە ڕاستی ئێمە ئادەمیزادمان لە ئاوێتەیەکی پێکهاتوو لە قوڕ بەدیهێناوە). هەروەها مرۆڤ لە سەرەتادا هیچ هەبوونێکی نەبووە :﴿ هَلْ أَتَىٰ عَلَى ٱلْإِنسَـٰنِ حِينٌ مِّنَ ٱلدَّهْرِ لَمْ يَكُن شَيْـًٔا مَّذْكُورًا ﴾ الإنسان(١). واتە: (بە ڕاستی ماوەیەکی زۆر لە ڕۆژگار بەسەر ئادەمیزادا هات کە شتێکی وانبوو ناو ببرێت). پاشان دروستبوونی مرۆڤ بە چەند قۆناغێکدا ڕۆیشتووە:﴿ مَّا لَكُمْ لَا تَرْجُونَ لِلَّهِ وَقَارًا وَقَدْ خَلَقَكُمْ أَطْوَارًا ﴾ نوح(١٣-١٤). واتە: (ئەوە چیتانە ئێوە قەدری خوا نازانن، بۆ ڕێزی بۆ دانانێن و لێی ناترسن، خۆ ئێوە پێشتر نەبوون، هەر خوا خۆی بە چەند قۆناغدا ئێوەی تێپەڕاند، و دروستی کردن). هەروەها دەڵێت:﴿ وَلَقَدْ خَلَقْنَـٰكُمْ ثُمَّ صَوَّرْنَـٰكُمْ ثُمَّ

﴿ وَلَقَدْ خَلَقْنَٰكُمْ ثُمَّ صَوَّرْنَٰكُمْ ثُمَّ قُلْنَا لِلْمَلَٰٓئِكَةِ ٱسْجُدُوا۟ لِءَادَمَ فَسَجَدُوٓا۟ إِلَّآ إِبْلِيسَ لَمْ يَكُن مِّنَ ٱلسَّٰجِدِينَ ﴾

الاعراف(١١). واته: (سوێند به خوا به ڕاستی ئێمه ( باوه گەورەی) ئێوەمان دروست کرد و نەخش و نیگاری ڕواڵەت و ڕوخساری ئێوەمان کێشا، پاشان وتمان بە فریشتەکان: ئادەی سوژده بەرن بۆ ئادەم جا هەموو فریشتەکان سوژدەیان برد جگە لە ئیبلیس لە سوژده بەران نەبوو). هەروەها دەڵێت:﴿ إِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَٰٓئِكَةِ إِنِّى خَٰلِقٌۢ بَشَرًا مِّن طِينٍ فَإِذَا سَوَّيْتُهُۥ وَنَفَخْتُ فِيهِ مِن رُّوحِى فَقَعُوا۟ لَهُۥ سَٰجِدِينَ ﴾ ص(٧١-٧٢). واته: (کێشەی فریشتەکان کاتێك بوو کە پەروەردگارت پێی وتن: من دەمەوێت بەشەرێك، لە قوڕ دروست بکەم، جا کاتێك دروستم کرد و لەو گیان و ڕۆحەی کە من خاوەنی ئەوم، فووم پێداکرد و گیان و ژیانم پێبەخشی ئێوەی فریشتە هەمووتان سوژدەی ( ڕێز و تەقدیری بە فەرمانی من) بۆ بەرن)...ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە چەند قوناغێك هەیە ، بە دروستکردن دەستپێدەکات پاشان وێنەکێشان ، پاشان ڕێکخستن ، پاشان فوّ تێکردن.

وشەی ( ثمّ ) واته پاشان ، بە کاتی خودای گەوره لەوانەیە بە ملیۆنەها ساڵ بێت: ﴿ ....وَإِنَّ يَوْمًا عِندَ رَبِّكَ كَأَلْفِ سَنَةٍ مِّمَّا تَعُدُّونَ ﴾ الحج(٤٧). واته: (... بە ڕاستی ڕۆژێك لە لای ئەو پەروەردگارت وەکو هەزار ساڵ وایە لەوەی کە دەیژمێرن ).

پاشان تێبینی قۆناغەکانی دروستکردنی مرۆڤ بکە . ئەوەی کە لە سورەتی (السجدة) هاتووە ، دەفەرمووێت :﴿ ٱلَّذِىٓ أَحْسَنَ كُلَّ شَىْءٍ خَلَقَهُۥ ۖ وَبَدَأَ خَلْقَ

ٱلْإِنسَٰنِ مِن طِينٍ ثُمَّ جَعَلَ نَسْلَهُۥ مِن سُلَٰلَةٍ مِّن مَّآءٍ مَّهِينٍ ثُمَّ سَوَّىٰهُ وَنَفَخَ فِيهِ مِن رُّوحِهِۦ ۖ وَجَعَلَ لَكُمُ ٱلسَّمْعَ وَٱلْأَبْصَٰرَ وَٱلْأَفْـِٔدَةَ ۚ قَلِيلًا مَّا تَشْكُرُونَ ﴾ السجده(٧-٩).

واته: ( ئەو خوایە زاتێکە هەموو شتێکی بە چاکی و ڕێکوپێکی بەدیهێناوە، لە سەرەتاوە ئادەمیزادی لە قوڕ دروست کردووە، پاشان زنجیرەی نەوەکانی لە ئاوێکی سادە و بێ نرخ بەدیهێناوە، پاشان ئادەمیزادی بە ڕێك و پێکی ڕێکخست، لە ڕۆح و گیانێك کە خۆی خاوەنیەتی فووی پێداکرد، ئینجا دەزگای بیستن و بینین و لێکدانەوەی پێبەخشیون، کەمتان سوپاسگوزارن)کەواتە ئادەم زنجیرەیەکی درێژ بووە بە چەند قۆناغێکدا تێپەڕیوە، نەك بە سەرەتایەکی ڕەها، خودای گەورە دەفەرمووێت :﴿ وَٱللَّهُ أَنۢبَتَكُم مِّنَ ٱلْأَرْضِ نَبَاتًا ﴾ نوح(١٧).. واتە:(هەر خوا خۆی ئێوەی لە خاکی زەوی بەدیهێناوە و پێی گەیاندوون... کەواتە لێرە کرداری چاندن هەیە بە هەموو قوناغ ۆ کات و ساتی چاندندا تێپەڕیوە...... بەڵام نهێنی ڕاستەقینە لەوەدایە کە ئایا ئەم قۆناغانە بە تەواوی چۆن بووە ؟ قۆناغەکان چۆن تێپەڕیون ؟ ئایا هەر دارێکی ژیان لە یەك باوکەوە هاتووە؟ هەموویان لە قوڕەوە هاتوون بەهۆی ئەو ئاوێتە کیمیاویانەی کە لە خۆ دەگرێت، هەر هەمووشیان کۆتاییان بە مردن دێت و دەگەڕێنەوە بۆ بنەڕەتی ڕاستەقینەی خۆیان....... ئەمە ڕاستییە...... بەڵام مەبەستمان لە پەیڤی باوك شتێکە زیاترە لە بنەڕەتە قوڕییەکەوەیە .

پرسیارەکە لێرەدا ئەوەیە ئایا لە قوڕ تەنها یەك ناوك و خانەی سەرەتایی دروست بووە، پاشان بووە زۆر خانە و ئەو هەموو جۆر و بەشی لە جیهانی ڕووەك و گیانەوەر بە مرۆڤەوە لێ دروست بووە ؟

یان سەرەتای جۆراوجۆریان هەبووە...... سەرەتایەك پەرەی سەندووە بۆ گژوگیا . سەرەتایەکی تر پەرەی سەندووە بۆ لقێك لە لقەکانی گیانەوەر ، بۆ نموونە وەکو ئیسفەنج. هەروەها سەرەتایەکی تر لقێکی تری لێ دروست بووە وەکو ماسیەکان ، سەرەتایەکی تر خشۆکەکان ، سەرەتایەك بووە هۆی پەیدابوونی باڵندە، یەکێکی تر بووە پەیدابوونی مەمکدارەکان و، یەکێکی تر مرۆڤی لێ پەیدابووە ؟! بەم شێوەیەش مرۆڤ جیا دەبێتەوە لەوانی تر. کەواتە هەر جۆرێك بنەڕەتێکی تایبەت بە خۆی دەبێت.

بە یەکچوونی لقەکان و جۆرەکان و توخمەکان کە لە ئەنجامی توێکاری زانستی دەرچووە، ئەم بۆچوونە ڕەت ناکاتەوە کە دەڵێت هەر جۆرێك لەم جۆرانە سەرەتایەکی تایبەت بەخۆی هەیە. بەڵکو ئەم بە یەکچوونە توێکارییە ئەوە دەگەیەنێت کە هەموویان یەك دروستکەریان هەیە . هەموویان لە یەك خامە و یەك شێواز و یەك داڕێژراو پەیدابوون...... ئەمە دەرئەنجامێکی چاوەڕوان کراوە، بەڵام پەیدابوونیان لە یەك باوك دەرئەنجامێکی چاوەڕوانکراو نییە. بەهۆی لەیەکچوونی توێکاری...... چونکە ئێمە دەبینین ئامێرەکانی گواستنەوە هەموویان وەکو یەکن، چەشنی گالیسکەکان ، شەمەندەفەر ، ئامێری والترام، وە دیزل. هەموویان لەسەر یەك بنەمای ئەندازیاری دانراون لە پێکهاتووەکان ، ئەمەش بەڵگەیە کە ئەمانە هەموویان دروستکراوی عەقڵی مرۆڤن....... بەڵام ئەمە ڕێگر نییە لەوە کە

هەر جۆرێك لە باوكێكی سەربەخۆوە هاتووە ، لە بیرۆکەیەکی ئەندازەی سەربەخۆ.

هەروەها ناکرێت ئێمە لە خۆمانەوە بڵێین ئەو گالیسکەی بە دەست پاڵدەدرێت پەرە دەسەنێت بەهۆی هەندێك یاسای نادیار بۆ گالیسکەیەکی بە ئەسپ ڕاکێشراو ، پاشان بۆ گالیسکەیەکی فۆرد . پاشان بۆ شەمەندەفەر ، پاشان بۆ ئۆتۆمبێلێك کە بە گاز کاردەکات.

بەڵام لە ڕاستیدا وا نییە.... چونکە هەر قۆناغێك لەم قۆناغانە بە جووڵە و پێشکەوتنێکی هزری بە عەقڵی داهێنەردا ڕۆیشتووە . هەروەها بازدانێك ڕوویداوە لە عەقڵی ئەندازیاردا ، هیچ جۆرێك لە جۆرێکی تر دەرنەچووە.... هەرچەندە ڕیزبەندی کاتیان لەوانەیە پشتگیری بێت بۆ بیرۆکەی دەرچوونی جۆرێك لە جۆرێکی تر.... بەڵام ئەوەی ڕوویداوە پێچەوانەی ئەم بیرۆکەیەیە. چونکە هەر جۆرێك بە جووڵەیەکی داهێناندا بە عەقڵی داهێنەردا ڕۆیشتووە، سەرەتایەکی سەربەخۆی هەبووە.... ئەمە هەڵەکانی زانا ( داروین )ن و کەموکورتیەکانی کە تێکەوتووە کاتێك بیردۆزەکەی دانا. با هەمووومان پێکەوە قسەکانی داروین بهێنینەوە بیرمان کە لە کتێبی ( أصل الأنواع )، واتە (بنەمای جۆرەکان) باسکراوە ، یەکەم شت کە داروین دۆزییەوە لە کاتی گەشتەکەی بە پاپۆڕی ( بیجل ) داڕێژراوێکی تونێکاری بوو ، کە هەموو جۆرە گیانەوەرەکان لەسەر دانابوو....... بۆ نموونە پەیکەری ئێسك لە زۆربەی گیانەوەرە بڕبڕەدارەکان وەکو یەکە. ئێسکی دەستی مەیموون هەمان ئێسکی باڵی باڵندە و شەمشەمەکوێرەیە ، هەر ئێسکێك لە بەرامبەریدا ئێسکی هەمان شێوە لەگەڵ کەمێك جیاوازی بۆ ئەوەی لەگەڵ سروشتی کارەکەی

بگونجێت....... ئێسکەکانی باڵندە باریک و بچووك و بۆشاییدارە و بە پەڕ داپۆشراوە....... ملی زەرافە درێژە کە حەوت فەقەرەی تێدایە ، دەستی مرۆڤ پێنج پەنجەی هەیە . دەبینین پەنجەی مەیموون و کەروێشك و بۆق و کیسەڵ هەمان ژمارەیان هەیە...... ماوەی ئاوسبوون و سکپڕی لە نەهەنگ و مەیموون و مرۆڤ (٩) مانگە. وە ماوەی پێدانی شیر لە هەموویان وەکو یەکە کە ئەویش دوو ساڵە........ بڕبڕەکانی کلکی مەیموون وەکو هی مرۆڤ وایە ، بەڵام لای مرۆڤ نزیك و بەیەك گەیشتوون کە پێ ی دەڵێن ( عصعص ) ، هەروەها ماسوولکەکانی کلك لای مرۆڤ بە شێوازێك ڕێکخراون کە دەکەونە بنی حەوزەکەوە . هەروەها دەبینین دڵی ئەسپ و گوێدرێژ و کەروێشك و کوتر و مرۆڤ لە چوار هۆبە پێك هاتوون. بەهەمان شێوە دابەشبوونی خوێنبەر و خوێنهێنەرەکان ، هەمان پێکهاتە لە کۆئەندامی هەرس دەبینین لە بۆری کرکراگە ، گەدە ، دوانزدەگرێ ، ڕیخۆلە باریکە ، ڕیخۆلەی ئەستوور ، شیکەرەوە پێك دێت ، پاشان کۆئەندامی زاوزێ بە هەمان شێواز و تایبەتمەندی ، هێلکەدان ، کۆنەکانی گون ، کۆنەکانی هێلکەدان...... کۆ ئەندامی میزەڕوو، گۆرچیلە ، حالب ، میزڵدان...... کۆئەندامی هەناسە ، بۆری هەوا ، سییەکان. ماسی و گیانەوەرە ووشکە ئاوییەکان سییەکانیان وەکو یەکە.

کەواتە شتێکی سروشتی بووە کاتێك داروین بۆچوونی ئەوە هەبووە کە هەموو گیانەوەرەکان دەگەڕێنەوە بۆ یەك خێزان، بەڵام دەوروبەر لێکیان جیا دەکاتەوە ، کە هەر بەشێك یان جۆرێك لەم گیانەوەرانە لەگەڵ دەوروبەر ڕاهاتوون گونجانێك لە نێوانیاندا ڕوویداوە....... نەهەنگ لە دەریای

بەستەلەك پێستێکی چەوری ئەستوری هەیە..... ورچەکان بە فەرو داپوشراون .

مرۆڤی دارستانەکانی هێلی کەمەرەی زەوی ڕەش پێستن، ئەم پێستە بووەتە سێبەرێك بۆ ئەم مرۆڤانە کە لە گەرمی رۆژ دەیانپارێزێت.

شەمشەمە کوێرەکانی ناو ئەشکەوت چاوەکانیان دادەخات . چونکە لە تاریکیدا سوودی لێ نابینیت تا وای لێهات کۆرە بوو ، لە بەرامبەردا شەمشەکوێرەکانی بیابان چاویان کۆرە نییە، بەڵکو دونیا پێدەبینن....... گیانەوەرە ئاویەکان بەشێوەیەك گونجاون و پەڕیان بۆ دروستبووە بۆ ئەوەی مەلەوانی پێی بکەن....... گیانەوەرە باڵندەکان وا گونجاون کە باڵیان بۆ دروست بووە بۆ ئەوەی لە کاتی فڕیندا بەکاری بهێنێت....... گیانەوەرە خشۆکەکان بەشێوەیەك گونجاون و دەست و پێیان بۆ دروست بووە بۆ ئەوەی بۆ ڕۆیشتن بەکاری بهێنن.

باشە ژیانی کۆرپەڵە چیرۆکێکمان پێ نابەخشێت. دەبینین لە قۆناغێکدا لەکاتی گەشە کردندا بە کەپوو هەناسە بدات . پاشان کەپوو لەناو دەچێت و دوو سی بۆ دروست دەبن، لە قۆناغێکی تردا دەبینین کلکی بۆ دروست دەبێت پاشان نامێنێت. لە قۆناغێکی تر مۆ لەسەر لاشەی دروست دەبێت، پاشان مۆوەکە نامێنێت.

هەروەها چینەکانی بەردین باسی چیرۆکێکی چەند زنجیرەییمان بۆ ناکات کە جۆرەکانی گیانەوەر دیاری دەکات و پاشان لەناو دەچێت و جۆرێکی تر بەدیار دەکەوێت ، لە گیانەوەرەکانی بچووك و سادە و یەکخانەیی ، بۆ فرە خانەیی ، بۆ گیانەوەرە نەرم و پەمووەکان. بۆ ئەوانەی پێستیان لەسەرە پاشان بۆ

ماسیەکان ، بۆ گیانەوەرە وشکە ئاوییەکان ، بۆ خشۆکەکان ، بۆ باڵندە ، بۆ مەمکدارەکان........ لە کۆتاییدا بۆ مرۆڤ.

زانا داروین زۆر سەرکەوتوو بوو کاتێك پێشەکییەکی بەم شێوەیە دانا، لە بەیەکچوونی توێکاری لە نێوان گیانەوەران ، هەروەها سەرکەوتوو بوو کاتێك کە گوتی گیانەوەرەکان پەرەدەسێنن ، بەڵام هەڵەی کرد کاتێك هەوڵی دا پەرەسەندن و گەشەسەندنمان بۆ ڕوون بکاتەوە . هەروەها هەڵەی کرد کاتێك قۆناغەکانی ئەم گەشە و پەرەسەندنە داینێت لەگەڵ وردەکارییەکانی هەر قۆناغێك. شیکردنەوەی داروین بۆ گەشەسەندن ئەوەی خستییە ڕوو کە بە چەند کردارێکی ماددی بەخۆڕاییدا دەڕوات ، کە ئەویش دەبینین گیانەوەرەکان بە ددانی تیژ و پەنجەی درێژ یەکتر دەکوژن ، لە شەڕێکی خوێناویی ترسناکدا ، کە بێ هێزەکان دەمرن و لەناو دەچن تەنها خاوەن هێز و تواناکان دەمێنن، شەڕێکە لە سروشتدا دەبێتە هۆی مانەوەی تاکی چاکتر و بەهێز ، کە هانی دەدات پارێزگاری لە نەوەکانی خۆی بکات. ڕێگاکانی ژیانیش بە ڕوویدا والا دەکرێن .

ئەگەر ئەم بیردۆزە ئەوەمان بۆ ڕوونبکاتەوە کە مانەوە تەنها بۆ بەهێزەکانە، لە بەرامبەردا ناتوانێت بسەلمێنێت کە مانەوە بۆ ئەوانەیە کە جوانترن ، کەواتە باڵی نەخشێنراو لە باڵندە هیچ دەسەڵاتێکی ماددی یان ژیانەوە بەسەر باڵی سپیدا نییە ، هەروەها لە فڕیندا لە وی چاکتر و خێراتر نییە ، ئەگەر بڵێین تاکی نێر هەردەم باڵی نەخشێنراوی پێ باشترە ، لە کاتی جووتبووندا . لێرە بۆمان هەیە پرسیار بکەین و بڵێین بۆچی ؟!...بۆچی ئەم نەخشەیە هیچ توانا و تایبەتییەك نابەخشێت ؟

چونكە ئەگەر بڵێین جوانی دەور و سەنگی هەیە لە ئامارەكاندا ، لێرە بیردۆزی ماددی لە بنەڕەتدا هەڵدەوەشێتەوە و بوونی نامێنێت.
بەم شێوەیە بیردۆزەكە هەروا بە هەڵواسراوی ماوەتەوە و ناتوانێت بۆمان ڕوونبكاتەوە بۆچی لە توخم و جۆری ئەسپەكان گوێدرێژ پەیدابووە ؟! بۆچی لە جیهانێكی دڕەندە شتێكی زۆر جوان و ناسك دروست بووە، وەكو ئاسك ؟! لەگەڵ ئەمەشدا لە هەموویان لاوازترە و گومانی لێ ناكرێت.
چۆن دەتوانین باڵەكانی هوودهوود و پەڕەكانی تاووس و پەپوولە ڕەنگا و ڕەنگەكان و سەرنج ڕاكێشەكان شیبكەینەوە ؟. ئێمە لێرەدا لە بەرامبەر دەستی وێنەكێش و هونەرمەندێكی داهێنەر داین...... نەك لە بەرامبەر شەڕێكی خوێناوی و توند داین، لە نێوان خاوەن ددان و پەنجە تیژەكان داین .
هەڵەی دووەم كە بیردۆزی پەرەسەندن تێكەوتووە ، ئەوەیە كە هەندێك كەس بیرۆكەیەكیان دانا بەناوی گۆڕانكاری لەناكاو ( الطفرة ) ، كە ئەویش بریتی بوو لە هەندێك سیفاتی نوێی لەناكاو لە نەوە و توخمێكدا ڕوودەدات، بەهۆی هەندێك گۆڕانكاری هەژمار بوو نەكراو، لە كاتی بەیەكگەیشتنی خانەی مێینە لەگەڵ خانەیەكی نێرینە لە كرومۆسۆمەكان، بۆ دیاركردنی سیفەتەكانی بۆماوەیی. هەندێك جار ئەم سیفەتە نوێیانە زیانبەخشن ، وەكو دروستبوونی نارێكی لە ئەندامەكان یان نەهاتنیان. هەندێك جاریش ئەم گورانكاریە لە ناكاوانە سوودبەخشن، بۆ گیانەوەرەكە، بەتایبەت كاتێك لە دەوروبەرێكی نوێدا دەژی، وەكو دروستبوونی پەنجەی قاز، بۆ ئەو گیانەوەرەی دەچێتە ناو ئاو . بەم شێوەیە دەبێتە سیفەتێكی نوێ.... چونكە پەنجەی قاز ئاسانكاری دەكات بۆ مەلەوانی كردن ، پاشان دەوروبەر ئەم سیفەتە كاریگەرتر دەكات و

دەگوازێتـەوە بـۆ نـەوەکانی داهاتوو ، سیفەتە کۆنەکە لـەناو دەچێت، لەبـەر نەگونجانی لەگەڵ ئەم دەوروبەرە نوێیە ، بەم شێوە پەرەسـەندن و گۆڕانکاری ڕوودەدات بەهۆی گۆڕینی پێی ئاسایی بۆ پێی پەردەدار........

هەڵەی ئەم بیرۆکەیەش ئەوەیە کە بەند بووە لەسەر بنەڕەتی گۆڕانکارییە لـە ناکاوەکان و هەڵەکانی بەخۆڕایی ، لێرەدا هەرچی کرداری تێڕوانین و داهێنانە بوونی نییە . هەروەها ناتوانرێت ئەم گۆڕانکارییانە چارەسەر بکرێن ، چونکە ئێمە دەبینین دەوروبەرمان لەسەر داهێنانێکی ورد و تونـدوتۆڵ دامـەزراوە لـە هـەموو شـتێکدا........ هـەموو پێـشکەییەك هێلکـەکانی دەخاتـە گۆماوێکـەوە. پاشان کە هێلکەکـە دەپیتێـت و نەوەیـەکی نـوێ دروسـت دەبێـت، هەریەکـەیان دوو کیسەی هـەوایی هەڵـدەگرێت بـۆ ئـەوەی سـەر ئـاو بکـەوێت ، باشـە ئـەم پێشکەیە چۆن فێـری یاسـا( ئەرخەمیـدس) کـراوە بـۆ چۆنیەتی بەسـەر ئـاو کەوتن ؟

دارەکانی بیابان تۆوێك دروست دەکەن کە باڵی پێوەیـە بـە سـەدەها کیلومـەتر لەگەڵ هەوا دەڕوات و ڕووبەرێکی بەرفراوان داگیر دەکات. ئـەم دارە بیابانیانـە لە کوێ فێری یاسای ئاوسبوونی هەوایی بـوون ؟ بـۆ ئـەوەی ئـەم تـۆوە باڵـدارە دروست بکەن لەگەڵ هەوا جووڵـە بکـات بـۆ دۆزینـەوەی شـوێنێکی گونجـاو بـۆ دووبارە شینبوونەوە !

هەروەها هەبوونی هەندێك گژوگیای ترسناك کە بۆ خۆی تەڵ دروست دەکات، فرتوفێڵ بەکاردەهێنێت بۆ ئەوەی مێشووله بگرێت و هەرسی بکات و بخوات ، بە چ عەقڵێك توانی ئەم تەڵ و فێڵانە دروست بکات ؟

ئێمە لێرەدا بەرامبەر عەقڵێکی گشتین، کە بیر دەکاتەوە و داهێنان دەکات بۆ زیندەوەرزانی خۆی ، هەندێك هۆکاری لە خشتەبردن پیشانیان دەدات......
کەواتە ناکرێت ئێمە بڵێین پەرەسەندن و گۆڕانکاری ڕوودەدات بەبێ عەقڵێکی داهێنەر:﴿ قَالَ رَبُّنَا ٱلَّذِيٓ أَعۡطَىٰ كُلَّ شَيۡءٍ خَلۡقَهُۥ ثُمَّ هَدَىٰ ﴾ طـه( ٥٠). واتە: (موسا وتی: پەروەردگارمان ئەو زاتەیە کە هەموو شتێکی بە تایبەتی و ڕێکوپێکی دروست کردووە، پاشان ڕێنموویی کردووە، تا بە چاکی دەوری خۆی ببینێت).
هەڵەی سێیەم لە بیردۆزی داروین ئەوەیە کە ئێستا زاناکان دۆزویانەتەوە بەناوی شەریتی کرۆمۆسۆمەکان، یان هێلکاری بۆماوەیی...... ئێستا زانیمان کە هەر جۆرە گیانەوەرێکی هێلکاری کرۆمۆسۆمی تایبەتی خۆی هەیە ، کە مەحاڵە جۆرێك لە جۆرێکی تر بچێت، چونکە هەر جۆرێك لە هێلکاری کرۆمۆسۆمی لە ئەوی تر جیاوازە.
دەرئەنجامی ئەمانە هەموویان دەتوانین بڵێین بیردۆزی داروین سەرنەکەوت. بەڵکو شکستی خوارد....... ئەگەر بەیەکچوونی توێکاری لە نێوان گیانەوەرەکان ڕاستی بێت و هەموو زاناکان کۆك بن لەسەر ئەمە ، هەروەها ئەگەر پەرەسەندن ئەویش ڕاستی بێت. بەڵام قۆناغەکانی ئەم پەرەسەندنە و چۆنیەتیان تا ئێستا هەر جێگای پرسیارە. ئایا لە سەرەتاکان ئەم جۆرانە لەیەکتر جیابوون یان هەندێك لە لقەکان دەگەڕێنەوە بۆ یەك ڕەچەڵەك ؟
پەرەسەندن بە وشە لە قورئاندا هاتووە. هەروەها قۆناغەکانی دروستبوون و شێوە و ڕێکخستن و فوو تێکردنی ڕۆح هەموویان هاتوون ، بەڵام تا ئێستا لێکۆڵینەوەی زانستی لەسەر بیردۆزێکی تەواو و جێگیر ڕانەوەستاوە، بۆ

ڕوونکردنەوەی ئەم قۆناغانە...... بۆ نموونە ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ سورەتی السجدة: ﴿ وَبَدَأَ خَلْقَ ٱلْإِنسَٰنِ مِن طِينٍ ثُمَّ جَعَلَ نَسْلَهُۥ مِن سُلَٰلَةٍ مِّن مَّآءٍ مَّهِينٍ ثُمَّ سَوَّىٰهُ وَنَفَخَ فِيهِ مِن رُّوحِهِۦ وَجَعَلَ لَكُمُ ٱلسَّمْعَ وَٱلْأَبْصَٰرَ وَٱلْأَفْـِٔدَةَ قَلِيلًا مَّا تَشْكُرُونَ ﴾ ، لێرەدا مانای ئایەت زۆر ڕوونە ، سەرەتاکانی دروستبوونی مرۆڤ ، ئەوەی کە ئادەم لێی دروست بووە ، بنەڕەتەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ئاوێکی خەست لەو کاتە هیچ گوێ و چاو و دڵێکی نەبووە .

ئەمانە پاش فوو تێکردنی ڕۆح پەیدابوون، کە ئەویش قۆناغی کۆتاییە لە دروستکردنی ئادەم. کەواتە سەرەتاییەکە هەروەکو ژیانێکی گیانەوەرانەی دواکەوتوو بووە.

﴿ هَلْ أَتَىٰ عَلَى ٱلْإِنسَٰنِ حِينٌ مِّنَ ٱلدَّهْرِ لَمْ يَكُن شَيْـًٔا مَّذْكُورًا ﴾. تەفسیری ئەم ئایەتە زۆر جیاواز نییە لەگەڵ بۆچوونی ئەو زانستانەی کە باسی دروستبوونی مرۆڤ دەکەن ، بەڵام هەمان ئایەت لەوانەیە مەبەستی قۆناغەکانی دروستبوونی کۆرپەڵە بێت لەناو سکی دایکی ، چۆن دروستدەبێت بە سەرەتاییەك کە هیچ بیستن و بینینی نەبوو بێت، پاشان فوتێکردنی ڕۆح دێت لە مانگی چوارەم و دروستکراوێکی تر دروست دەبێت...... کەواتە ئایەتەکانی دروستبوون بە یەکچوونێك لە نێوانیاندا هەیە ، قورئانیش زیاتر لە یەك بۆچوونی هەیە لە ڕووی تەفسیرەوە........ئەمەش لە ڕاستیدا هێشتا هەر نادیار و جێگای پرسیارە ، کەس ناتوانێت بڵێت من ڕاستیم دۆزیەوەتەوە....... پرسیاریش گراوەیە بۆ لێکوڵینەوە لەسەری . ئەوەی کە تا ئێستا بە ڕێگای زانست دۆزراوەتەوە هەموویان گریمانن........ لەوانەیە نزیکترین و ڕاستترین ڕا

لەبارەی دروستبوونی مرۆڤ و چۆنیەتی مرۆڤەوە کە لە قورئان هاتووە:﴿ ٱلَّذِي خَلَقَكَ فَسَوَّىٰكَ فَعَدَلَكَ فِيٓ أَيِّ صُورَةٖ مَّا شَآءَ رَكَّبَكَ ﴾ الانفطار(٧-٨). ..لەوانەیە ڕێکخستن و دروستکردنێك بێت لە ڕەچەڵەکدا زۆر نزیك بێت لە ئەندازەی بۆماوەیی، کەواتە ڕووداوەکە پەرەسەندن نییە ، هەروەکو داروین باس دەکات، بەڵکو پەرەسەندنێکە ڕوودەدات بەهۆی فرمانێکی خودایی، بە دانانی زیندەوەرێکی زیندوو دروستکراو لە قوڕ ، ئامادەکراوە بۆ ئەوەی پێشوازی لە فۆتێکردنی ڕۆح بکات. واتە ببێت بە نەفس و ئادەمی لێ دروست بکرێت.

ئایا دەکرێت نەفس وێنەیەکی هەبێت بە قاڵبێکی پزیشکی دانابێت ، چەند لاشەیەکی جۆراوجۆری هەبێت و مێژوو و پەرەسەندنی هەبێت ؟! یان چۆنیەتی شێوازەکەی لە زانستی خودا دایە لە ئەزەلەوە ؟!..... هەرخودا دەزانێت....... بابەتەکە هەمووی نادیار و تاریکە..... لەوانەیە باشترین تێگەیشتن بۆ کرداری پەرەسەندن ، ئەمە بێت کە بڵێین پەرەسەندنەکە بووە بە فرمانێکی خودایی و زاتێکی داهێنەری شارەزا، نەك پەرەسەندنێکی خۆڕەسی هەروەکو چۆن داروین باس دەکات لەگەڵ هەوادارانی ئەو ..... ئەم قۆناغانە بەجێنەهێشتووە بۆ کرداری لەناکاو...... بەڵکو دروستکردنێکی خوازراو داڕێژراو بووە، بەهۆی خودایەکی دروستکەر و حەکیمانە ، کە ئەندازەیەکی بۆماوەییە بە دەست ئەندازیارێکی زۆر گەورەوە ، کە هیچ شتێك وەکو ئەو نییە....... کەواتە ئەوەی لە قورئاندا هاتووە ڕاستترین وێنەیە بۆ چۆنیەتی ڕووداوەکە....... دڵنیابوون و بڕیاری کۆتایی لەم بابەتە ئەستەمە....... بۆیە قورئان خۆی پێشکەش دەکات بەبێ ئەوەی جێگرەوەی هەبێت.

# بــــــەشــی پازدەهەم

## - وشەی هیچ خودایەک نییە تەنها (الله) نەبێت

هاورێیەکەم گوتی ئایا تۆ لەگەڵم هاوڕا نیت، کە ئێوە زۆر زیادەڕەوی دەکەن لە بەکارهێنانی وشەی ( هیچ خودایەك نییە تەنها ( الله ) نەبێت ) ؟، هەروەها پێتان وایە کە ئەم وشەیە کلیلی هەموو دەرگایەکە...... بەم وشەیە ماڵئاوایی لە مردوو دەکەن...... پێشوازی لە لەدایکبوونی منداڵ دەکەن.... لەسەر هەموو مۆرێك دادەنێن...... لەسەر زنجیرەکان و پارەی بەکارهاتوو نەخشە سازی دەکەن هەروەها لەسەر دیوارەکان دادەنێن.......

هەر کەسێك لە ئێوە ئەم وشەیە بە زمان بڵێت لە ئاگر ڕزگاری دەبێت...... ئەگەر سەد هەزار جار بڵێت دەچێتە بەهەشتەوە...... هەروەکو شتێکی سیحراوی یان پارێزەر لە جنووکە و دەرکردنیان لە لاشەی مرۆڤ یان بەستنیان.....؟!.. پاشان ئەو پیتانەی لە سەرەتای سورەتەکانی قورئاندا

هاتوون کە ئێوە مانای نازانن...... باشە من ئێستا بڵێم ( لا إلە إلاّ الله ) ، رزگارم دەبێت، ئەگەر وایە کەواتە من وا دەڵێم و تۆ دەکەم بە شایەت لەگەڵ ئامادەبووان..... ئایا بەو شێوەیە بە تەواوی رزگارم دەبێت ؟!

- بەڵکو تۆ هیچت نەگوتووە...! چونکە ( لا إلە إلاّ الله ) دەبێت کاری پێ بکەی ، نەك تەنها زمانت پێ بجووڵێنی. لا إلە إلاّ الله کارکردن و ڕێڕەوی ژیانە ، نەك تەنها چەند پیتێکە..... با کەمێك بیر لە ماناکەی بکەینەوە...... کاتێك ئێمە دەڵێین، لا إلە إلاّ الله، واتە هیچ پەرستراوێك نییە تەنها الله نەبێت ، لە نێوان ( لا ) و ( إلاّ ) نەرێ و ئەرێ لەم دەستەواژەیەدا بیروباوەڕ بەدیار دەکەوێت ، ( لا )ی نافییە واتە نەرێنی، ڕەت کردنەوەی خوداوەندییە لە هەموو شتێك...... لە هەموو شتێکی حەزلێکراو لەم دونیایەدا ، لە سامان و پایەبەرزی و دەسەڵاتداری. ئارەزووەکان، ئاسوودەیی و ئافرەتی جوان...... بەمانە هەموویان دەڵێین: نەخێر...... تۆ ناپەرستم ، چونکە تۆ خودا نیت...... دیسان بە تاخی خۆمان دەڵێین نەخێر بۆ ئەو شتانەی حەزت لێیەتی ، چونکە مرۆڤ خۆپەرستە، حەز و ویست و ڕاو بۆچوونی خۆی دەپەرستێ. ژیری و ناوبانگی و پێ بەخشراوەکانی خۆی دەپەرستێ ، وا هەست دەکات هەموو شتێك بە دەستی ئەوە. بەڕێوەبردنی خەڵك . کۆمەڵگا..... خۆی دەکاتە خودا بەبێ ئەوەی بزانێت بەم نەفس و ناخە دەڵێین نە خێر..... نەخێر تۆ ناپەرستین..... تۆ خودا نیت. بە سەرۆك و حاکم و بەڕێوەبەر دەڵێین نەخێر.... چونکە تۆ خودا نیت.

وشەی ( إلە ) واتە بکەر ، بکەریش هەر ( الله )یە، واتە شتەکانی تر وەکو سەرۆك ، وەزیر ، بەڕێوەبەر ، سامان و سەروەری نەفس بە هەموو

پێدراوەکانی ئەمانە هەموویان هۆکار و ئامرازن....... پێیان دەڵێین نەخێر چونکە ئێوە خودا نین.

( إلأ ) دەرهێنانی هەموو شتێکە لەو بکەرییە، تەنها ( الله ) نەبێت. تەنها ( الله ) یە توانای بکەری و خودایی هەبێت..... کەواتە لە نێوان ئەم نەخێر و بەڵێیەی ( لا ) و ( إلأ ) کە لە دەستەواژەکەدا هاتووە ، بیروباوەڕ بەرجەستە دەبێت. واتە ئەوەی خەریکی کۆکردنەوەی سامانە ، بەدوای سەروەری و دەسەڵاتدا دەگەڕێت، بەدوای گەورە پیاو و خۆشی و ئارەزووەکانی خۆیدا دەگەڕێت ، حەزی لە ڕای خۆیە و پشتگیریی لێ دەکات..... ئەم جۆرە کەسانە ناڵێن نەخێر بۆ ئەم پەرستراوانە . خۆی کڕنۆشیان بۆ دەبات بەبێ ئەوەی هەستی پێ بکات ، کاتێك دەڵێت (لا إله إلأ الله) درۆ دەکات ، تەنها بە زمان دەڵێت، بە کردار ناسەلمێنێت ، دەست و پێیەکانی ئەنجامی نادات.........

واتای (لا إله إلأ الله ) ئەوە دەگەیەنێت کە هیچ چاودێرێك ، ژمێریارێك نییە تەنها ( الله ) نەبێت ، خۆی بە تەنیا شایەنی لێ ترسان و پاڕانەوە و چاودێرییە...... هەر کەسێك لە دەرد و نەخۆشی بترسێت لە میکرۆبەکان بترسێت ، لە داری پۆلیس بترسێت لە کاربەدەستانی دەسەڵات بترسێت . ئەو کەسە بەم شتانەی نەگوتووە نەخێر ، بەم هەموو خوداوەندانە. بەڵکو لە ڕاستیدا کڕنۆشیان بۆ دەبات ، هەموویان دەکاتە هاوەڵ بۆ خودای تاك و تەنیا ، کەواتە درۆزنە لە گوتنی وشەی (لا إله إلأ الله ) .

چونکە وشەی (لا إله إلأ الله ) ڕێڕەو و دەستوورە، پەیڕەوی ژیانە ، مەبەست کارپێکردنە، ئەوەی کاری پێ بکات دەبێتە ڕۆشنایی و ڕێنیشاندەر بۆی، دەرگا

نـەكراوەكانى بـۆ دەكاتـەوە...... دەبێتـە رزگاركـەر لـە دونيـا و دوارۆژ ، مـرۆڤ بەرەو بەهەشت دەبات .

بە زمان گوتن بـەبێ ئـەوەی بـە دڵ و دەست و بـێ كـارى پـێ بكرێـت سـوودى نييە ، چونكە وشەى (لا إله إلاّ الله )، واتاى لەمە زياتر لە خۆ دەگرێت. د. زكي نجيـب محمـود دەڵێـت شـهادەتى (لا إلـه إلاّ الله ) دان نانـە بـە سـێ شـتى ڕاستەقينە...... دان نانـە بـەوەى كـە شاهد بـوونى هەيـە ، مەشهوودەكانيش بوونيــان هەيــە..... ئــەو ئامادەبووانــەى شــەهادەت لــە پــێش چــاويان ئەنجامدەدرێت بوونيان هەيە. واتە ئەم وشەيە دان دەنێت بە هەبوونى خودا. وە خــودى خــۆى ، هــەروەها ئامــادەبووان ئەوانــە هــەموويان هــەبوونى ڕاستەقينەيان هەيە.

بەم شێوەيە ئيسلام فەلسەفەى ميساليەت ڕەت دەكاتەوە ، هەروەها فەلسەفەى ماددیش لە هەمان كات ڕەت دەكاتەوە، ڕاست يان چەپ ڕەت دەكاتـەوە، بـەڵكو مامناوەندى هەڵدەبژێرێت...... فەلسەفەى ميساليەت ڕەت دەكاتـەوە؛ چونكە ئەم فەلسەفەيە بوونى ئـەوانى تـر ڕەت دەكاتـەوە ، هـەروەها بـوونى هـەبوونى جيهانى بابەتى ڕاستەقينە وەك ڕاستييەكى سەربەخۆ لـە جيهـانى عـەقڵ...... بەڵكو هەموو شتێك بە ڕاى فەلسەفەى ميسالى هـەبوونى تـەنها لـە خەونـدایـە لەناو مێشك..... يان لەناو بيرى عەقڵی.... راديۆ، شەقام ، كۆمەڵگا ، ڕۆژنامـە ، شەڕ ،........ ئەوانە هەموويان ڕووداون لە جيهانى نەبينراو لە جيهانى خەون و عەقڵدا....... ئەم جيهانە بينـراوە هـيچ هـەبوونى ڕاسـتەقينەى نييـە . ئـەم بۆچوونە ئيسلام ڕەت دەكاتەوە، چونكە ئەمە دان پێدانێكى ڕاستەقينەيە بـۆ ئەوەى كـە خـودا ، خودى مـرۆڤ ، خـەڵكانى تـر و هـەموويانى دروستكردووە.

هەروەها ئیسلام فەلسەفەی ماددیش ڕەت دەکاتەوە ، چونکە فەلسەفەی ماددی باوەڕی تەنها بە هەبوونی ئەم جیهانە ماددیە بینراوە هەیە ، بڕوای بە هیچ شتێکی تری نییە و بەپێی ئەم فەلسەفەیە بێجگە لەم دونیایە...... جیهانی نەبینراو و خودا بوونیان نییە ،. لە بەرامبەردا ئیسلام فەلسەفەیەك پێشکەش دەکات، کە فەلسەفەیەکی مامناوەندی و واقیعبینانەیە ، بیرێکی ڕاستەقینەیی. کە دان دەنێت بە جیهانێکی ماددی و بابەتیانە. هەروەها لەگەڵ ئەوەشدا باوەڕی هەیە بە جیهانێکی نەبینراوی خوداییش...... ئاوێتەیەکی کۆکراوەیی دیالێکتی پێشکەش دەکات بیرێکە دەکەوێتە نێوان بیری ڕاست و بیری چەپ ، لە فەلسەفەیەکی کۆکراوەدا کە تا ئێستا بەرەنگاری هەموو بیرۆکە فەلسەفییەکان دەبێتەوە ، لە پێش هەموو ئەم بیردۆزانە کەوتووە کە لەسەر گومان بنیات نراون نەك لەسەر دڵنیایی. کەواتە شایەتی (لا إله إلاّ الله ) پەیڕەوی ژیانە و بۆچوونی فەلسەفیانەیە.

لەبەر ئەوە تۆ درۆزنی، چونکە تۆ پیاوێکی ماددی ، دەروازەیەکی فەلسەفی ماددیت هەڵدبژاردووە ، کاتێك بە زمان شایەتی دەدەی، دوو درۆ ئەنجامدەدەی، یەکەمیان ئەوەیە تۆ پێچەوانەی ناخی خۆت بڕیار دەدەی، واتە پێچەوانەی فەلسەفەی خۆت. دووەمیان، ئەوەیە تۆ کار بەم شایەتییە ناکەیت لە ژیانی رۆژانەتدا.

لەبارەی پرسیارەکەت بۆ مانای پیتەکانی( أ. ل. م . کهیعص . حم . الم) . ڕێگام پێ بدە پرسیارت لێ بکەم لەبارەی ( س ، ص ) لوگاریتمەکان ، یاسای هاوکێشەی توانا = ك + س٢ . ئەوانە هەموویان بۆ کەسێك کە هیچ لەبارەی بیرکارییەوە نەزانێت نابنە شتی نادیار و تاریك ؟ لە

بەرامبـەردا بـــۆ زانـا و شـارەزاكان مانـاى زۆر و ترسـناك دەگەيـەنن...... هەروەهـا ئـەم پيتانـەش كاتێك ماناكانيـان بۆمـان روون دەبنـەوە...... پاشان هاورێيەكەم بە گاڵتەوە گوتى: كەواتە تۆ مانايان دەزانى ؟...... من گوتم ئەمە بابـەتێكى زۆر گرنگە، پێويستى بـە قسەى زۆر هەيـە و زۆر هەڵدەگرێ ، كە سـەرت دەسـووڕێنێت.

# بـــــەشی شازدەهەم

## - پیتەكانـــی (كـــــهیعص)

بە هاوڕێ بێباوەڕەكەم گوت:

گومانی تێدا نییە ئەم پیتانەی كە لەسەرەتای سورەتەكانی قورئانـدا هـاتوون یەكەم جار كە چاوت پێ كەوت تووشی دلەڕاوكێ بوویت.....( ألم . حم . طسم . كهیعص . ق . ص ). باشە یەكەم جار كە ئەو پیتانـەت خوێنـدەوە چیت بـۆ دروست بووە ؟

- هەردوو لێوەكانی خۆی لە سەر یەك دانا و هەم هـەمێكی لێ دەرچوو، بـەبێ ئەوەی مەبەستی بێت. گوتی ئەوە.......

- گوتم ئەمە چی ؟

- گوتی ئەمە قسەیەكە پێغەمبەر گاڵتەتان پێ دەكات !

- گوتم باشە با ئەم قسانە تاقی بکەینەوە ئەوەی کە تۆ دەڵێیت ، قسەی بێ مانا و پڕ و پووچن ، پێغەمبەر بەم قسانە گاڵتەتان پێ دەکات...؟

بۆ نموونە با سورەتێکی بچووك وەربگرین وەك سورەتی ( ق )... تاقی بکەینەوە... دەبینین پیتی ( ق ) (٥٧) جار لە سورەتەکەدا هاتووە...... سورەتی دوای ئەو، کە سورەتی ( الشورى ) یە، دوو ئەوەندەی سورەتی ( ق )ە. کە ئەویش (٥٧) پیتی ( ق ) ی تێدا هاتووە. ئایا ئەمە شتێکی هەر لە خۆیەوەیە ئەگەر ( ٥٧ + ٥٧ = ١١٤ ) کە دەکاتە ژمارەی سورەتەکانی قورئان..... ئایا دەزانی سورەتی ( ق ) بە چی دەستپێدەکات و بە چی کۆتایی دێت؟ بە :﴿ قٓ ۚ وَٱلۡقُرۡءَانِ ٱلۡمَجِيدِ ﴾ ق(١). دەستپێدەکات، هەروەها بە:﴿ ...فَذَكِّرۡ بِٱلۡقُرۡءَانِ مَن يَخَافُ وَعِيدِ ﴾ ق(٤٥)، کۆتایی دێت.... هەر دەڵێی ئەوانە ئاماژەن بۆ ئەوەی کە ( ق ) واتە قورئان...... واتە کۆی قافەکان دەکاتە ( ١١٤ ) کە دەکاتە ژمارەی سورەتەکانی قورئان.

- هاوڕێکەم گوتی: ئەمانە شتانێکن هەر لە خۆیەوە دروست بووە.
- بە هێواشی گوتم بەردەوام دەبیت . سورەتەکانی قورئان دەخەینە ژێر عەقڵی ئەلیکترۆنی و پرسیاری لێ دەکەین بۆ ئەوەی پیتەکانی ( ق ) لە هەموو قورئاندا بۆمان بخاتەڕوو ؟.
- هاوڕێیەکەم بە دەروونێکی شلەژاوەوە، بە ئاگا هات و گوتی: ئەم شتە کراوە ؟!
- زۆر بە هێواشی گوتم: بەڵێ کراوە.
- گوتی پاشان ئەنجامی چۆن بوو ؟.

- عــەقڵی ئـەلیکترۆنی پێمـان دەڵێـت ڕێـژەی هـەرە زۆری پیتـی ( ق ) لـە سورەتی ( ق ) دایە، ئەگەر بەراوردی بکەین لەگـەڵ هـەموو سـورەتـەکانی تـری قورئان...... ئایا ئەمە هەر لە خۆیەوە(هەڕەمەکی) ڕوویداوە ؟!

- گوتی: سەیرە !

ســـورەتی ( الرعــد ) بـــە پیتـــەکانی أ . ل . م . ر دەســـتپێدەکات . عـــەقڵی ئـەلیکترۆنی پێمـان ڕادەگەیـەنێت کـە پیتـەکان بـەم شـێوە لـە سـورەتەکەدا هاتوون.

أ (٦٢٥) جار هاتووە.

ل (٤٧٩) جار هاتووە.

م (٢٦٠) جار هاتووە.

ر (١٣٧) جار هاتووە.

بە هەمان ڕیزبەندی سەرەتای سورەتەکە.

أ . پاشـان ل. پاشـان م . پاشـان ر . بـە ڕێژەیـەکی دابـەزێنراو... پاشـان عـەقڵی ئەلیکترۆنی بۆمان دیار دەخات کە هاتنی ئەم پیتانە لـە هـەموو قورئانـدا...... شتە سەیرەکە لەوەدایە کە بەرزترین ڕێژەی هاتنی ئـەم پیتانە لە ســـورەتی ( الرعـد ) دایـە ، وە ئـەم سـورەتە لـە هـاتنی ئـەم پیتانـە زۆرتـرە لـە هـەموو سورەتەکانی قورئان.

بە هەمان شێوە، پیتی أ.ل.م لە سورەتی البقرة:

أ (٤٥٩٢) جار هاتووە.

ل (٣٢٠٤) جار هاتووە.

م (٢١٩٥) جار هاتووە.

به هەمان ڕیزبەندی أ.ل.م دابەزێنراوە.

پاشان عەقڵی ئەلیکترۆنی پێمان دەڵێت ئەم سێ پیتانە لە هەموو پیتەکانی تر زیاتر لە سورەتی (البقرة) دا هاتوون.

هەمان چیرۆك لە أ.ل.م. لە سورەتی ( آل عمران ) :

أ (٢٥٨٧) جار هاتووە.

ل (١٨٨٥) جار هاتووە.

م (١٢٩٥) جار هاتووە.

بە هەمان ڕیزبەندی دابەزێنراو لە هەموو پیتەکانی تر زیاتر هاتووە لەم سورەتەدا.

هەروەها لە سورەتی ( العنكبوت ) أ.ل.م :

أ (٧٨٤) جار هاتووە.

ل (٥٥٤) جار هاتووە.

م (٣٤٤) جار هاتووە.

بە هەمان ڕیزبەندی دابەزێنراو لە هەموو پیتەکانی تر زیاتر هاتووە لەم سورەتەدا.

هەروەها أ.ل.م لە سورەتی ( الروح ):

أ. (٥٤٧) جار هاتووە.

ل. (٣٩٦) جار هاتووە.

م. (٣١٨) جار هاتووە.

بە هەمان ڕیزبەندی دابەزێنراو لە هەموو پیتەکانی تر زیاتر هاتووە لەم سورەتە.

له هەموو ئەو سورەتانەی بە پیتی أ.ل.م دەستپێدەکات دەبینین لە سورەتە مەککەییەکان ژمارەی ئەم پیتانە ڕێژەیان زیاترە لەو سورەتانەی تری مەککی.
وە سورەتە مەدەنییەکان کە ئەو پیتانەی تێدا هاتووە ژمارەی ئەو پیتانە ڕێژەیان زیاترە لە سورەتەکانی تری مەدەنی.
بە هەمان شێوە أ.ل.م.ص لە سورەتی الأعراف عەقڵی ئەلیکترۆنی پێمان دەڵێت ڕێژەکانی ئەم پیتانە بەرزترە لە هەموو پیتەکانی تری سورەتی( الأعراف). هەروەها بەرزترە لە سورەتە مەککەییەکانی ناو قورئان.
لە سورەتی (طه) دەبینین پیتی ( ط ) و پیتی ( ه ) ڕێژەی هاتنیان لەم سورەتەدا بەرزترە لە هەموو سورەتەکانی مەککی.
هەروەها پیتەکانی ( کهیعص ) لە سورەتی مریم ڕێژەیان لە هەموو سورەتەکانی مەککی بەرزترە.
هەروەها هەموو ئەو سورەتانەی بە پیتی ( حم ) دەستپێدەکەن . ئەگەر هەموویان کۆبکەینەوە دەبینین پیتی (ح ) و پیتی ( م ) لە هەموو پیتەکانی تر زیاترن لە سورەتەکانی مەککی.
بەهەمان شێوە ئەو دوو سورەتەی بە پیتی ( ص ) دەستپێدەکەن ، سورەتی (ص )و (الأعراف )( أ.ل.م.ص ). کە هەردووکیان بەدوای یەکتردا دابەزیوون ، ئەگەر پێکەوە کۆ بکەیتەوە ژمارەیان زیاتر دەبێت لە هەموو سورەتەکانی تر.
هەروەها ئەو سورەتانەی بە پیتی( أ.ل.ر )دەستپێدەکەن. کە سورەتی ابراهیم و یونس و هود و یوسف و الحجر. چوار سورەت لەم سورەتانە بەدوای یەکدا هاتوونەتە خوارێ بەپێی مێژووی سروش. ئەگەر هەموویان پێکەوە کۆ

بکەینەوە . عەقڵی ئەلیکترۆنی پێمان دەڵێت ڕێژەی هاتنیان زیاترە لە هەموو سورەتەکانی مەککی لە قورئاندا.

لە سورەتی ( یس ) تێبینی هەمان شت دەکەین، بەڵام بە پێچەوانەوە، چونکە ڕیزبەندی پیتەکان پێچەوانە بووتەوە پیتی (ي) لە سەرەتای سورەتی ( یاسین ) کۆتا پیتی زمانی عەرەبیە. هەر لەبەر ئەمە دەبینین هـاتنی پیتی (ي) و ( س ) لەم سورەتە کەمترە لە پیتەکانی تر .... کەواتە ئاماژە ژمێرياریيەکە هەیە، بەڵام بە پێچەوانەوە. لەو ساتە هاوڕێیەکەم بێ دەنگ ببوو، بۆ دڵنەوایی ئەو گوتم: من ئەو قسانە لە خۆمەوە ناکەم، بەڵکو ئەمە لێکۆڵینەوەیەکە، زانایەکی میسری لە ئەمەریکا پێی هەستاوە ، کە ئەویش دکتۆر رشاد خلیفە یە..... ئەو کتێبەی لەبەر دەستە، بە درێژی باسی ئەم بابەتە دەکات. کتێبەکەم بە زمانی ئینگلیزی پێشکەشی هاوڕێیەکەم کرد کە لە ئەمریکا چاپ کرابوو بۆ هەمان نووسەر .... ئەویش کتێبەکەی وەرگرت و دەستی کرد بە تەماشاکردنی لاپەڕەکانی بەبێ ئەوەی قسە بکات. گوتم: کەواتە مەسەلەکە لە خۆیەوە نەبووە ...... بەڵکو ئێمە بەرامبەر چەند یاسایەکی وردین. چەند پیتێکی ژمێردراو، کەهەر پیتێك بە تەرازوویەك دانراوە. پاشان ئەم ئایەتەم بۆ خوێندەوە:﴿ ٱللَّهُ ٱلَّذِىٓ أَنزَلَ ٱلْكِتَـٰبَ بِٱلْحَقِّ وَٱلْمِيزَانَ ۗ وَمَا يُدْرِيكَ لَعَلَّ ٱلسَّاعَةَ قَرِيبٌ ﴾ الشوری(١٧).واتە:( خوا ئەو زاتەیە کە کتێبە پیرۆزەکانی بە حەق و ڕاستی ڕەوانە کردووە، هەروەها شەریعەتێکی دابەزاندووە کە وەکو تەرازوو و پێوەر وایە بۆ هەڵسەنگاندنی حەق و ناحەق، جا چی تۆی فێرکردووە و چووزانی لەوانەیە ڕۆژی قیامەت و لێپرسینەوە

نزيك بێت) . لێرەدا باسی چ پێوەرێك دەكات ..... ئێمە بەرامبەر پێوەرێكین، هەتا پارچە مۆ و پیتەكان هەژماری بۆ دەكرێت. وابزانم ئەو بیرۆكەی كە دەڵێت پێغەمبەر قورئانی نووسیوە و لە پێشدا بڕیاری داوە. سورەتی ( الرعد ) بە ( أ ، ل ، م ) دەستپێبكات وە بە زۆرترین ڕێژە ئەم پیتانەی تێدا بهێنێتەوە كە هێشتا نەینووسیوە ... وابزانم ئەم بیرۆكەیە ئێستا جێگای ڕاستی و قەبووڵ نییە .... ئەو كەسە لە كوێیە كە ئەم هەموو ڕێژانەیی بۆ دەرهێناوە، كە ئەویش كارێكی گرنگە تەنها عەقڵێكی ئەلیكترۆنی نەبێت ، ئەگەر پێغەمبەر خۆی ئەم كارە بكات دەبێت چەند ساڵێك كار بكات بۆ ئەوەی ئەم پیتانە بژمێرێت لە یەك سورەتدا، كۆ دەكاتەوە، كەم دەكاتەوە، بەپێی زانستی سەردەمی خۆی، كە ئەویش لە زانستی سەردەمی خۆی هیچ نازانێت، هەرخۆی چۆن دەبێت كار بكات و ژمێریارێك بۆ پیتەكان بەكاربهێنێت ..... ئێمە لێرە بەرامبەر شتێكین كە ئەستەمە ڕووبدت. ئەگەر بزانین كەوا قورئان بەش بەش دابەزیووە لە ماوەی (٢٣) ساڵدا ، كەواتە ئێمە دەتوانین بزانین دانانی ئامارێكی ڕێژەیی پێش وەختە بۆ ئەم پیتانە ئەمیش مەحاڵێكی ترە ...... ئەمە كارێكە تەنها خودای زانا دەزانێت، ئەو خودایەی كە هەموو شتێك دەزانێت پێش پەیدابوونی شتەكە، كە شتەكان زۆر بە وردی و دیققەت. خێراتر لە هەموو عەقڵێكی ئەلیكترۆنی ..... ئەو ( الله )یە هەموو وردەكاری لەبارەی شتەكانەوە دەزانێت ...... ئەم پیتانەی لە سەرەتای سورەتەكاندا هاتوون، نیشانە و ئاماژەن بۆ زانستی ئەو خودایە، لەناو قورئاندا پەرش و بڵاوكراوەتەوە، بۆ ئەوەی ئێمەی مرۆڤ بە درێژایی كات بیدۆزینەوە:

﴿ سَنُرِيهِمْ ءَايَٰتِنَا فِى ٱلْءَافَاقِ وَفِىٓ أَنفُسِهِمْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ ٱلْحَقُّ ۗ أَوَلَمْ يَكْفِ

بِرَبِّكَ أَنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ شَهِيدٌ ﴾ فصلت(٥٣). واته:(ئێمه له ئاییندەدا بەلگە و نیشانەی سەرسوڕهێنەریان نیشان دەدەین لە ئاسۆکانی بوونەوەردا و لە خودی خۆیشیاندا، ئەمەش بۆ ئەوەی تا چاك بۆیان ڕوون بێت و دڵنیابن کە ئەو زاتە حەق و ڕاست و ڕەوایە، ئایا شایەتی پەروەردگارت بەس نیە کە بێگومان ئاگا و زانایە بە هەموو شتێك)... من ناڵێم ئەمانە تەواوی نهێنیەکانی پیتەکانن ... بەڵکو تەنها سەرەتایەکە، کەس ناتوانێت بڕیار بدات کە بەرەو چ ئاستێك دەمانبەن. ئەم پیتانە بەم ئامازە وردانە بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە ئەم قورئانە لە نووسراوی کەس نییە. چونکە دەمانخاتە بەرامبەر هەندێك یاسای ورد و ئامازەی قووڵ بۆ هەر پیتێك. کەس ناتوانێت بڵێت و لەخۆیەوە قسە بکات.

هاوڕێیەکەم، تۆ تێبینی ناکەی ئێمە شتێکمان لەبەر دەستە ناکرێت وەکو هەموو قسەیەك باسی بکەین. هاوڕێیەکەم وەڵامی نەداوە، بەڵام هەر وا بە بێ دەنگ مایەوە و پەڕەکانی کتێبێکەی هەڵدەدایەوە ، هەڵی دەدایەوە بەبێ ئەوەی یەك وشە لە دەمی بێتە دەرەوە.

# بـــــــەشی حەڤدەهەم

## - مـــوعـــــجیزە

هاوڕێیەکەم گوتی: من نازانم چۆن دەکرێت خودایەکی دلۆڤان کە ئێوە وەسفی دەکەن بە نەرم و نیان و خۆشەویست و بەخشندە و لێخوشبوو....... چۆن ئەم خودایە بە پێغەمبەرێکی نزیکی خۆی بڵێت کەوا( ئیـبراهیم)ە کوڕی خۆی سەرببڕێت؟! ئایا تۆ لەگەڵم هاوڕانیت کە ئەم مەسەلەیە زۆر سەختە باوەڕی پێ بکرێت ؟

- چیرۆکەکە لە سیاغی واتاکەیدا ئەوە ناگەیەنێت کە خودای گەورە بەڕاستی داوای سەربڕینی کوڕەکەی لێ کردبێت. بەبەڵگەی ئەوەی کە بەڕاستی سەربڕینەکە روینەدا، بەڵکو مەبەستی ڕاستەقینەی ئەوە بوو کە ئیبراهیم ئەو خۆشەویستییە لە ڕادە بەدەری کە بۆ کوڕەکەی هەی بوو، بکوژێت ..... زیادە خۆشەویستی خۆی بۆ کوڕەکەی. چونکە ناکرێت لەناو دڵی

پێغەمبەرێکدا بێجگە لە خودا ، کەسێکی تر بێجگە لە خودا جێگای هەبێت ... نە دونیا نە کوڕ، نە دەوڵەمەندی و هەبوونی، نە سەروەری.... ئەم شتانە نابێت لە ناو دڵی پێغەمبەردا جێگایان هەبێت. ئێمە دەزانین کاتێك کە خودای گەورە ئیسماعیلی بە ئیبراهیم بەخشی، لە تەمەنی پیریدا بوو..... لەبەرئەوە لەناو دڵیدا بوو و زۆر خۆشی دەویست .... لێرەدا تاقیکردنەوەی خودا بۆ پێغەمبەرەکەی هات وەك پێویستییەك .... ئەوەی کە لە رووداوەکەدا روویدا ئەم بۆچوونە دەسەلمێنێ ، هەربۆیە دەبینین کاتێك ئیبراهیم پێغەمبەر چەقوویەکەی دەرهێنا و دەستی بە سەر بڕینی کوڕە خۆشەویستەکەی کرد، خودای گەورە ڕێگای پێنەدا و بۆی گۆڕییەوە بە بەرانێك.

- باشە ڕات چۆنە لەبارەی موعجیزاتی ئیبراهیم کە چووە ناو ئاگر بەبێ ئەوەی بسووتێت..... هەروەها ئەوەی موسا پێغەمبەری کردی لەدوای ئەودا. کاتێك دارەکەی لەناو دەستیدا، بۆ بە مارێکی گەورە، هەروەها هەر بەم دارە دەریای کرد بە دوو پارچە، دەستی خۆی دەخاتە ژێر باڵی ، دوای دەردەهێنێت کە سپی بووە.... باشە ئەم کارانە بۆ تۆ وەك بەهلەوانییەك دیار نییە کاتێك لە سیرك ئەنجامدەدرێت؟.....

چۆن دەکرێت خودا بەم کارانە گەورەیی - توانایی خۆی بۆمان دەربخات؟! کە ئەم کارانە لە ڕاستیدا هەندێك کاری ناڕەوان بە عەقڵ قبووڵ ناکرێت؟! هەندێك نموونەن لەسەر لاسار بوون لەسەر ڕێڕەوی یاسا سروشتییەکان .... باشە تۆ بڕوات وانییە کە گەورەترین بەڵگە لەسەر گەورەیی خودا تەنها یاسا

و عەقڵ و ڕێکوپێکی یاساکانی ئەم گەردوونەن، کە زۆر بە جوانی ڕێك خراون بەبێ ئەوەی بەریەك بکەون؟!

- تۆ لێرە بە هەڵە لە موعجیزە تێگەیشتی، بۆچوونت لەبارەی موعجیزەوە هەڵەیە .... موعجیزە بە بۆچوونی تۆ کارێکی بەهەڵەوانی و زیرەکانەیە، دەرچوونە لە یاسا، یاخود شتێکە کە عەقڵ قەبوولی ناکات، بەڵام ڕاستی، پێچەوانەی ئەم بۆچوونەیە.

لێم گەڕێ با نموونەیەك بهێنمەوە بۆ ئەوەی بابەتەکە بۆ هۆشت نزیك بکەمەوە.... باشە ئەگەر ڕێتپێبدەن (٣٠٠٠) ساڵ بۆ دواوە بگەڕێیەوە، پاشان بچیتە لای فیرعەونی میسر، و ترانزستەرێکی بچووکیشت بەقەدەر شقارتەیەك بە دەستەوەیە، هەر لەخۆیەوە گۆرانی دەڵێت و موسیقا لێدەدات..... ئایا لەو حاڵەتە فیرعەون و هاوڕێکانی چۆن هەڵسوکەوت دەکەن؟!.... لەو کاتە بێگومان هاوار دەکەن ئەمە (موعجیزەیە، سیحرە، دەرچوونە لە یاساکان)، بەڵام ئێستا ئێمە ئەم شتەمان بەدەستەوەیە و دەزانین نە موعجیزە لە گۆڕێ هەیە، نە سیحرە، نە دەرچوونە لە یاساکان، بەڵکو ئەوەی لەناو تراتزستۆرەکە ڕوودەدات، کارێکە بەپێی یاسا و زانستی ئەلیکترۆنی کار دەکات، هەروەها زۆر لای عەقڵ جێگیرە. شتەکە سەرسوڕماتر دەبوو ئەگەر بچیتە لای پاشای بابلیەکان و تەلەفزیونت بە دەستەوە بێت وێنەی ڕۆمەکانت بۆ بگوازێتەوە و پاشای ئاشوور ئاسوودەتر دەبوو ئەگەر بچوویتایە لای و بازنەیەکت بە دەستەوە بێت و بسوورێنیتەوە و قسەی بۆ بکات !

مێـژوو چـیرۆکێکمان بـۆ دەگێڕێتـەوە کاتێـك کـە داگیرکـەرە ئەوروپیـەکان کیشوەری ئەفریقیایان داگیرکرد، فڕۆکەیەك بۆ یەکەم جار لەناو کەسانێکی دواکـەوتوو لـە دارسـتانێك نیـشتەوە. لـەو کاتـە چـی روویـدا؟.... هـەموو پێستڕەشە ڕووتەکان کڕنۆشیان برد. دەفیان لێدا، گیانەوەریان سـەربڕی، وایـان دەزانـی کـە خـودا لـە ئاسمانـەکان هاتووەتـە خـوارەوە. پێیـان وابـوو کـە ئـەم ڕووداوە پێچەوانەی هـەموو یاسایەکە، بـەڵام ئێمـە ئێـستا دەزانـین کـە فڕۆکـە هەیە دەتوانێت بفڕێت بـە یاسایەك دەفڕێت و بـە یاسایەك دەنیـشێتەوە ... ئـەم فڕۆکەیـە بـە پێـی چـەند یاسایەکی ئەنـدازەی ورد دروسـتکراوە، کەواتـە فڕینی ئەم فڕۆکەیە شتێکی باوەڕپێکراوە بە تەواوی.... فڕینـی ئـەم فڕۆکەیـە پێچەوانەی یاسای کێشکردنی زەوی نییە، بەڵکو هەر بەم یاسایە کار ناکات. بە یاسایەکی تـر کاردەکات کـە ئـەویش یاسای کاروکاردانەوەیـە. کەواتـە لێـرەدا جۆرەها یاسا هەن، نەك کارکردن بـە پێچەوانەی یاسـا. یـان دەرچـوون لەسـەر یاسا.

ئـاو بـەرەو سـەرەوە دەڕوات لـەناو ڕەگ و چـینەکانی دار بـۆ لقـەکان. بـە پێچەوانەی یاسای کێشکردن. بـەڵام دەرچوون نییـە لەسـەر یاسای کێشکردن. بەڵکو کارکردنە بە یاسایەکی ڕووەکی تایبەتمەند و کـاراتر بـۆ ئـەم مەبەستە. یاسای ڕاگرتنـی داری ئـاوی، یاسـای تایبەتمەنـدی دەزوولـەیی، یاسـای پەسـتانی ئەزموونی. ئەوانە هەموویان یاسان، ئاو بەرەو سەرەوە پاڵ دەدەن. ئێمـە هـیچ کاتێـك لـە شتی عـەقڵی و قـەبوولکراو دەرناچـین. ئـەوەی کـە ڕوویـدا کـارێکی زیرەکانـــە و بەهلـــەوانی نـــەبوو .... بـــەڵکو سەرســـوڕمانی پێـــستڕەشە دواکەوتووەکان بووە بەهۆی نەزانین و نەفامی ئەوانەوە لەبارەی ئەم یاسایانە

... هەروەها سەرسوڕمانی تۆش لەبارەی موسا پێغەمبەر کاتێك دەریای کرد بە دوو پارچە، دارەکەی گۆڕا بۆ مار ، زیندووبوونەوەی مردووەکان لەسەر دەستی عیسا پێغەمبەر، چوونە ناو ئاگری ئیبراهیم پێغەمبەر بەبێ ئەوەی بسووتێت..... تۆ وات دەزانی کە ئەمە شتێکە جێگای قەبووڵ نییە و دەرچوونە لەسەر یاساکان. زیرەکایەتی و بەهلەوانیەتە ..... لەگەڵ ئەمەشدا هەرهەموویان ڕوویانداوە بەپێی بڕیاری خودا و ئیرادەی ئەو، چونکە یاسای ئەو، لە سەرووی هەموو ئەو یاسایانەیە کە تۆ دەزانی و بڕوات پێت هەیە ..... کەواتە هەموویان نیزامن و قەبوڵ کراون، بەڵام لە سەرەوەی تێگەیشتنی ئێمەن، خودای گەورە بەم موعجیزانە ڕێڕەو و یاساکان تێکنادات، بەڵکو ڕێڕەوێکی تر کە باشترە پیشانمان دەدات و دەمانکاتە شایەت لەسەر ئەم ڕێڕەوە. یاسایەکی بەرزتر، عەقڵێکی گەورەتر لە تێگەیشتنی ئێمە ، حەز و ئارەزوویەکی لە هەموو حەز و ئارەزووەکان بەهێزتر. بەهائییەکان ( تیرەیەکی ئایینین، بیروباوەڕیان ئاوێتەیە، لە هەموو ئایینەکان وەرگیراوە ) کەوتنە هەمان هەڵەی تۆ کاتێك موعجیزەکانی پێغەمبەرانت ڕەت کردەوە. باوەڕیان وابوو کە قەبوولکردنی موعجیزە کەم کردنەوەی عەقڵە، پاشگوێ خستنیەتی، لەبەر ئەمە هەوڵیاندا مانا و واتاکانی قورئانی پیرۆز بگۆڕن. واتا دیار و ڕاستەقینەکان بشێوێنن. گوتیان موسا پێغەمبەر بە داری خۆی دەریای پارچە نەکرد بەڵکو، مەبەستی ئەوەیە کە موسا بە شەریعەتی خۆی چاك و خراپی لێکجیاکردەوە. واتە داریان بە شەریعەت تەفسیر کرد. بەهەمان شێوە گوتیان دروستبوونی دەستێکی سپی نیشانەیە بۆ دەستی چاکە کردن. زیندووکردنەوەی عیسا بۆ مردووەکان، زیندووبوونەوە نەبووە بۆ لاشەکان ،

کاتێك چاوی نابینایانی چاك دەكردنەوە. واتە كردنەوە بوو بۆ عـەقڵیان نـەك ساغكردنەوەی چاوی كوێر(نابینا) .....

بـەم شـێوەیە قورئـان لـە واتـا ڕاسـتەقینەكانی دوورخرایـەوە بـۆ هەنـدێك شیكردنەوە و تەفسیری وەرگێراو و هێمایی. هەر كاتێك مانای ئایەتەكە لەگـەڵ عەقڵیان گونجاو نەبوایە پەنایان بۆ ئەم كارانـەیان دەبـرد.... ئەمـەش ڕوویـدا، چونكە تێگەیشتنیان بۆ موعجیزە تەواو نەبوو، گوتیان شتێكە عـەقڵ قـەبووڵ ناكـات. دەرچـوونە لـە یاسـاكان. لـەناوبردنی ڕێڕەوەكانـە، ئـەوە هـەمان ئـەو هەڵەیە كە تۆ تێكەوتووی.

لە ڕاستیدا ئێمە لە سەردەمێكدا دەژین موعجیزە تیایـدا كـارێكی نـامۆ و دوور لـە قـەبووڵ نییـە .... بینیمـان كـە چۆن زانـست ئێمـەی بـرد بـۆ سـەر مـانگ، ئەگەر زانستی عەقڵی مرۆڤ ئەم هەموو تواناییەی هەبێت، گومـانی تێـدا نییـە زانستی تایبەتی خودای گـەورە دەسـەڵاتی زیـاتری هەیـە. دەتوانێـت شـتی زۆر گەورەترمان پێ ببەخـشێت، گـوێ لـەم ئایەتـە پـیرۆزە جوانـە بگـرە:﴿ يَٰمَعۡشَرَ ٱلۡجِنِّ وَٱلۡإِنسِ إِنِ ٱسۡتَطَعۡتُمۡ أَن تَنفُذُواْ مِنۡ أَقۡطَارِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ فَٱنفُذُواْۚ لَا تَنفُذُونَ إِلَّا بِسُلۡطَٰنٖ ﴾ الرحمن(٣٣)... واتە: (ئەی گرۆی پەری و ئادەمیزاد ئەگـەر دەتـوانن بە بەشەكانی ئاسمانەكان و زەویدا دەرچن، ئەو كارە ئەنجام بدەن، دڵنیاش بـن كـە ئـەوكارە بـە هـۆی دەزگـای مـاددی و توانـای مەعنەوییـەوە نـەبێت ئـەنجام نادرێت). ئەو سەروەرییەی (السلطان) كە لەناو ئایەتەكە مەبەستیەتی زانستی مرۆڤەكانە كە لەوی گەورەتر زانستی خوداییە.

# بـــــەشی هەژدەهەم

## - مانای ئایییـــن (الدیـــن)

هاورێیەکەم گوتی: گوێبگرە ... ئەگەر بەهەشت بوونی هەبێت هـەروەکو ئێـوە بڕواتان پێی هەیە، من یەکەم کەسـم کـە بـچمە نـاو ئـەو بەهەشـتەوە، چـونکە مـن کەسـێکی زۆر بـڕوادارم. لـە زۆربـەی بانگخوازەکـان و خـاوەن ڕیـشەکان و تەسبیحدارەکانی ئێوە پڕ باوەڕدارترم؟

- تۆ باوەڕدارتری.... مەبەستت چییە؟

- مەبەستم ئەوەیە، من کەس ئازار نادەم. کـەس نـاکوژم، بـەرتیل وەرنـاگرم و لە کەسیش نادەم، حەسودی بە کەس نابەم، رقم لە کەس نییە. پیلان و نیازی خـراپ بـۆ هـیچ دروسـتکراوێك لـەناو ناخمـدا نییـە. نیـازم تـەنها ئەنجامـدانی کـردەوەی چـاکە. ئامـانجم سـوود بەخـشینی گـشتییە، دەخـەوم و هەڵدەسـتم

ویژدانم ئارام و جێگیرە، دروشمی ژیانم چاکخوازییە بەپێی توانام ....... باشە ئەمە واتای ئایین نییە ..... ئێوە هەردەم دەڵێن ئایین هەڵسوکەوتە؟!

- ئەمە شتێکە ناوێکی تری هەیە، ناوی ژیاننامەی چاك و خاوێنە. کردەوەی پاکە..... ئەمانە پێداویستیەکانی ئایینن، نەك خودی ئایینە، تۆ ئایین و پێداویستیەکانی ئایین ئاوێتە دەکەی.. ئایین تەنها یەك مانای هەیە. ئەویش ناسینی خودای گەورەیە. خودای خۆت بە تەواوی بناسی. پاشان لە نێوان تۆ و ئەو خودایەدا هەڵسوکەوت و کردەوە هەبێت. خودای خۆت بە گەورە، پاك، نزیك، وەڵامدەر بزانی، خودا هەموو شتێك دەبیستێ و دەبینێ، لێی دەپارێیەوە. کڕنۆشی بۆ دەبەی، لێی دەترسیی، ترسانی بەندە لە خودا... ئەم هەڵسوکەوتە تایبەتییە لە نێوان تۆ و خودا پێی دەووترێت ئایین.... بەلام هەڵسوکەوت و کردەوەی چاك لەگەڵ براکانت، ئەمە لە پێداویستیەکانی ئایین و ئایینپەروەرییە ئەمەش لە ڕاستیدا هەڵسوکەوتە لەگەڵ خودا.

- پێغەمبەرمان (دروودی خودا لەسەر بێت) دەفەرموێت: (( إنّ الصّدقة تقع في يد الله قبل أن تقع في يد السائل )) واتە: (بەخشین یەکەم جار دەچێتە دەستی خودای پەروەردگار، پێش ئەوەی بکەوێتە دەستی پرسیارکەر، یان هەژار).

هەرکەسێك خودای خۆی خۆش بوێت، دەبێت بەندەکانی ئەوی خۆش بوێت و چاکەی لەگەڵدا بکات..... بەلام کاتێك تۆ چاکە تەنها لەگەڵ خەڵك دەکەی، بێجگە لە خەڵك کەس نەناسی، بێجگە لە ئەوان کەسی تر نەبینی، تەنها دونیا دەبینی و بڕوای پێ دەکەی، لەوکاتە تۆ بەتەواوی بێ باوەڕی. با کردەوەکانت چاك و باشیش بن لەگەڵ خەڵکەکان.... ئەم هەڵسوکەوتەت. ژیان پاکییەت

بەڵگەیە لەسەر زیرەکایەتی تۆ لە سیاسەت و ڕەوشت و سروشتت. بەڵگەیە لەسەر خودی چاکت، نەك بەڵگەیە لەسەر ئایینداری تۆ. بەو شێوەیە تۆ دەتەوێت خەڵك بۆ خۆت ڕابکێشیت، بۆ ئەوەی لە ژیانت سەرکەوتوو بیت.... ژیان پاکیت و کردەوە چاکەکانت تەنها ئامرازێکن بۆ بەدەستهێنانی دونیا..... کە ئەمەش لە سیفەتەکانی زۆربەی بێ باوەڕەکانی وەکو تۆن.

- باوەڕ بکە من هەردەم هەست دەکەم کەوا هێزێك هەیە؟

- هێزێك.....!

- بەڵێ..... هێزێکی وون بوو لە پشت ئەم گەردوونەوە.....من باوەڕی تەواوم هەیە کەوا هێزێك هەیە......

- بۆچوونت چۆنە بۆ ئەم هێزە ؟.... ئایا وا هەست دەکەی کە بوونەوەرێکە دەبیستێ و دەبینێ، شت دەناسێت و پەیمان بە دروستکراوەکانی دەدات کە بەخێویان بکات و ڕێنماییان بکات و بەرەو ڕێی ڕاست ئاراستەیان بکات، کتێب لە ئاسمان دەهێنێتە خوارەوە، پێغەمبەران دەنێرێت. بە دەم هاوار و پاڕانەوەیانەوە دێت؟!

- بەڕاستی من بڕوام بەم قسەیە نییە و لەناو خەیاڵدا ئەم بیرۆکەیە بوونی نییە، زیاتر لەوە دەبینم شتێکی زۆر سادەیە و شایەنی ئەم هێزە گەورەیە نییە؟!

- کەواتە ئەم هێزە، هێزێکی مۆگناتیسی کوێرە، ئەم گەردوونە بەڕێوە دەبات بەشێوەیەکی ناڕێکوپێك. هیچ نیزامێکی بۆ نییە..... ئەمە سیفەتێکە لەگەڵ ئەو هێزە گەورەیە دەگونجێت کە تۆ بڕوات پێی هەیە....؟

- لەوانەیە.....

– ناشیرینترین سیفەتە دەخەیە پاڵ خودای خۆت.... بینینی بۆ تۆ داناوە تۆ دەڵێی ئەو کوێرە.... تێگەیشتن و شارەزایی بە تۆ بەخشیوە. تۆ دەڵێی ئەو هێزێکی ڕەهایە، هیچ شارەزایەکی نییە..... بەخودا تۆ بێ باوەڕێکی تەواوی، هەرچەندە بەدرێژایی تەمەنت چاکەکار و کردەوەی چاکیش ئەنجامبدەیت.... چارەنووسی کردەوە چاکەکانت هیچ سەنگێکیان نییە لە ڕۆژی دواییدا، بەڵکو دەبێتە تۆز و لەگەڵ هەوا بڵاو دەبێتەوە.

– باشە ئەم کارە ستەمکاری نییە؟!

– نەخێر، ئەوە دادپەروەری ڕاستەقینەیە. چونکە تۆ وات دەزانی ئەم کارە چاکانە لە زیرەکایەتی تۆیە، هیچ ڕێنیشاندەری بە دواوە نەبووە، ئەو خودایەی کە چاکەی پیشانی تۆ داوە ستەمی لێ دەکەی. بە چاکەی ئەوت نەزانیوە..... ئەوەیە جیاوازی نێوان کارە باشەکانی باوەڕدار و کارە باشەکانی بێ باوەڕ.... ئەگەر هەردووکیان ژیانی پاك و کردەوەی چاکیان هەبێت... بۆ نموونە هەریەکەیان نەخۆشخانەیەك دروست بکات، پیاوی بێ باوەڕ دەڵێت: من ئەم نەخۆشخانە گەورەیەم بۆ خەڵك دروستکردووە... پیاوی باوەڕدار دەڵێت: خودای گەورە یارمەتیدەر بوو بۆ من، تا ئەم نەخۆشخانەیە بۆ خەڵك دروست بکەم، من تەنها ئەلقەی پەیوەندیدارم.. لێرە جیاوازیەکی زۆر هەیە..... یەکێکیان ئەنجامدانی ئەم کردەوە چاکە دەگەڕێنێتەوە بۆ خاوەنە ڕاستەقینەکەی چاکەکە، خۆی تەنها وەك ئەلقەی بەیەکگەیاندنی دەزانێت، سەرەڕای ئەوەش سوپاسی خودا دەکات و دەڵێت : خودایە سوپاست دەکەم کە منت کردە هۆکار بۆ تەواوبوونی ئەم کارە چاکە...... یەکێکی تریان هەموو کردەوە چاکەکە بۆ خۆی دەگەڕێنێتەوە و دەڵێت: من،. من هەموو

شتێکم......جیاوازیەکی زۆر هەیە لە نێوان خۆ بە گەورە دانان و خۆ بەکەم دانان.....لەنێوان گەورە حال و کەم حال. لە نێوان ستەمکاری و نەرم و نیانیدا..... لەبەر ئەوە ئێوە بە ئایینی بت پەرستی خۆتان بڕوای خۆتان بەم هێزە مۆگناتیسی کوێرەیە هەیە، بۆیە نوێژ ناکەن و کڕنۆش بۆ خودا نابەن.......

- ئێوە بۆچی نوێژ دەکەن و بۆ کێ دەکەن؟ من هیچ حیکمەتێك لە نوێژەکانتاندا نابینم..... باشە بۆچی ئەم هەموو شێوازە جۆراوجۆرەی جووڵانەوەتان هەیە؟ ئایا نەدەکرا تەنها بە ملکەچی ڕابوەستن؟.

- حیکمەت لە نوێژکردنەکە ئەوەیە لەخۆبایبوون و گەورەیی ناڕاستەقینەی مرۆڤ بشکێنێت، لەوکاتەی کە کڕنۆش دەبەی و نێوچەوانت دەگەیەنیتە سەر زەوی، وە بە زمان و دڵی خۆت دەڵێی: ( سبحان ربي الأعلى )..... لەوکاتە خۆت دەناسی و دەزانی کە تۆ شوێنەکەت لە خوارەوەیە، وە شوێنی خودا لە سەرەوەیە، هەروەها دەسەلێنی کە تۆ خۆڵی و لەسەر خۆڵی، خوداش زاتێکی گەورە و بەرزە لە سەرووی حەوت ئاسمانەکانەوەیە ... سەبارەت بە پرسیارەکەت کە دەڵێی بۆچی ئەم هەموو جووڵە جۆراوجۆرانە لە نوێژدا هەیە ئایا نەدەکرا ڕاوەستان بە ملکەچییەوە بەس بێت، واتە مەلکەچی دڵ و دەروونی...... من لێرەوە پرسیارت لێ دەکەم باشە بۆچی خودای گەورە ئەم جەستەیە لە بنەڕەتدا دروست کردووە...... بۆچی خۆشەویستی بە زمان بەس نییە..... دەتەوێت لە باوەش بگری و ماچی بکەی؟!

بۆچی مەردایەتی بە زمان بەس نییە دەچیت بە دەست و سامانت ئەم مەردایەتیە دەسەلێنی؟...... خودای گەورە ئەم جەستەیەت بۆ دروست دەکات

بۆ ئەوەیە ئایا ترس و شەرمەزاری و پاڕانەوەکەت جەستەشت دەگرێتەوە، دەچی کڕنۆش دەبەی؟ ئەگەر ترس و شەرمەزارییەکەت درۆ بێت لە زمانت تێناپەڕێت؟!

- ئایا بڕوات وایە کە دەچیتە بەهەشت؟

- هەموومان دەچینە سەر ئاگر.......

پاشان خودای گەورە مرۆڤە لە خودا ترسەکان ڕزگار دەکات، ئەوجا من نازانم تۆ مرۆڤێکی خودا ترسی یان نا؟.... ئەم شتە تەنها خودای شارەزا لە دڵەکان دەزانێت.... من هەموو کارەکەم.. بەداخەوە مەرەکەبی سەر کاغەزە...... لەوانەیە کردەوەم چاك و ڕاست بێت، بەڵام نیازم ڕاست نەبێت ...... وە لەوانەیە نیازم ڕاست بێت، بەڵام کردەوەم چاك و ڕاست نەبێت، یان نیازم پاك بێت بەڵام ئیخلاسم نەبێت..... کاتێك تاکێك کردەوەیەکی چاك ئەنجامدەدات بۆچوونیان وایە کە ئەم کارە بۆ خودا دەکات، بەڵام لە ڕاستیدا بۆ ناووبانگدەرکردن، یان بۆ دونیا، یان بۆ ئەوەی خەڵك بڵێت پیاوێکی چاکە.... زۆر کەس لە ئێمە لە ناخەوە هەڵخەڵەتاوە، شەیتان سەری لێ دەشێوێنێت و وا هەست دەکات خۆی ڕاستە و پشتڕاستییەکی نادروستی بۆ دەرەخسێت بەبێ ئەوەی بزانێت...... هیواداریین خودای گەورە بمانپارێزێت.

- ئایا مرۆڤ دەتوانێت دڵسۆز بێت؟!

- ئەم حاڵەتە هەر لە خۆیەوە بۆی دروست نابێت..... بەڵکو تەنها خودا دڵەکان دڵسۆز دەکات..... هەر لەبەرئەمەیە زۆربەی ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز باسی (موخلەسەکان) دەکات نەك (موخلیسەکان)، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا خودای گەورە بەڵێن دەدات ئەو کەسانە بخاتە سەر ڕێگای ڕاست، ئەوانەی کە

دەگەڕێنەوە و لە تاوانکردن پەشیمان دەبنەوە، واتە هەرکەسێك بگەڕێتەوە بۆ لای ئەو.... کەواتە لەسەرتە بگەڕێیتەوە، ئەوی تر بەدەستی خودایە......

# بــــــەشی نوزدەهەم

## - ئێمە ئاسوودەیی دونیامان بردەوە، ئێوەش خەیاڵپڵاویەکان

هاوڕێیەکەم وا هەستی دەکرد کە سەرکەوتووە، لە خۆشییا گوتی:

- هەرچەند جیاوازی لە نێوانمان هەبێت و کاتێکی زۆر خەریکی گفتوگۆ و قسە بین؛ گومانی تێدا نییە ئێمە سەرکەوتوو تر بووین لە ئێوە لەم شەڕەقسەیەدا، ئاسوودەیی دونیامان بەدەست هێناوە، ئێوەش هەندێ خەیاڵپڵاویتان لە مێشکدا دروست بوو . باشە لەوکاتە قسەکردن چ سوودێکی هەیە ئەگەر ئێمە لەم دونیایەدا بەشی شێرمان دەست کەوتبێت؟!..... ئێمە شەونخوونی، سەرخۆشی، ئافرەتی جوان، سامانێکی زۆر، تێرکردنی ئارەزووەکان. شتە خۆشەکان بەبێ ئەوەی بیر لە حەرامی بکەینەوە و بێتە ڕێگر لەم خۆشیانە، هەموو ئەوانەمان بەدەست هێنا.... بۆ ئێوەش ڕۆژوو،

نوێـژ، تەسـبیح هـەڵگرتن، ترسـان لـە لێپێـچینەوە لـە ڕۆژی دوایـی..... باشـە کامەمان قازانجی کرد؟!!

- ئەمــە ڕاســت دەبێــت ئەگــەر ئــەوەی بەدەســتتانەوە هێنــاوە ئاســوودەیی ڕاستەقینە بێت..... ئەگەر ئێمە کـەمێك بـە ووردی بـیر بکەینـەوە ، دەبینـین ئـەو شـتانەی کـە تـۆ باسـت کـرد، شـەونخوونی، سەرخۆشـی، ئـافرەتی جـوان، سـامانێکی زۆر. ئـارەزوو و شـتە خۆشـەکان کـە هـیچ حەرامییـەك ڕێگـری لێ نـەکات..... لـە ڕاسـتیدا دەبیـنین ئاسـوودەیی نییـە، بـەڵکو دەردەسـەری و ناخۆشییە......

- دەردەسەری و ناخۆشی...... چۆن؟!

- چونکە لە ڕاستیدا ئەم کارانە بەندایەتییە بۆ هەندێك ئارەزوو کە تێر نابن تا برسی ببێت، ئەگەر زۆری لێ بکەی و بە بەردەوام ئـەم کارانـە ئەنجامبـدەی. لێی تێردەبیێ و دووردەکەوێتـەوە و ساردییەکت بـۆ دروسـت دەبێـت، تووشـی گێڵـی و سـادەیی و تەمبـەڵیت دەکـات...... ئایـا هـیچ کاتێـك باوەشـی ئـافرەت بووەتــە شــوێنی گونجــاو بــۆ ئاســوودەیی...؟... دڵــەکان بــە بــەردەوام لــە گۆڕانکاریدان، حەز و خۆشەویستی هیچ کاتێك جێگیر نـین لەسـەر حاڵەتێك. ئافرەتی جوانیش هەردەم دەیەوێت مـەدحی بکەی... زۆر چیرۆکی دڵداریمان خوێندووەتەوە، کە کۆتاییەکەی هـەر نائومێـدی بـووە. کاتێـك بـە یـەکتر ڕازی دەبن و شو بە یەکتر دەکەن، نا ئومێدییەکە زیاتر دەبێت، ئەو شتەی کـە بـە خەیاڵ بۆ خۆی دروستی دەکرد بەکردەوە بە دەست ناهێنێت، هـەردوولا ئـەو جوانی و تەواویەی لە یەکتریدا بەدیار دەکرد، دوای بەیەکگەیشتن لـە دەسـتی دەدەن. دوای لە یەکتر تێربـوون و لاوازبـوونی شـەهوەت، هەریـەکێکیان چـەند

کەمو کوڕی لە ئەوی تردا دەدۆزێتەوە، هەروەك چۆن بە میکروسکۆب گەورە گرابێت...... ئایا پێت وانییە کە زۆربوونی سامان و دەوڵەمەندبوون، بەندایەتییە..؟ کابرای دەوڵەمەند دەبێتە بەندە لە خزمەت سامانەکەی، کۆی دەکاتەوە و زۆری دەکات و چاودێری لێ دەکات. لە کۆتاییدا دەبێتە بەندەی ڕاستەقینە، نەك خزمەتکار بۆ سامانەکەی..... دەسەڵاتداری و پلە و پایە، تەنها تووشی ستەم و خۆگەورەکردن و لەخۆبایی بوونت، حاڵی دەسەلاتدار هەردەم وەك حاڵی ئەو کەسە وایە کە لە پشتی شێر سوار دەبێت، ڕۆژێك دێت شێرەکە لە پشتی ئەو سوار دەبێت. هەروەها ڕۆژێك دێت شێرەکە ئەو دەخوات...... ئایا تۆ پێت وایە سەرخۆشی و خواردنەوە. مادده هۆشبەرەکان بێ شەرمی و کاری سێکسی، دوور لە چاودێری، دوور لە حەرام ئاسودەییە؟ کردنی ئەم کارانە تەنها هەڵاتنە لە عەقڵ و ویژدان و تێنوویەتی ڕۆح. هەڵاتنە لە بەرپرسیاریەتی و نقوومبوونە لە شەهوەت و تێرکردنی ئارەزووەکان... ئایا ئەم کارانە سەربەرزییە بۆ مرۆڤ یان سەرشۆڕی و نزمبوونەوەی مرۆڤە بۆ ڕیزی مەیموون و ئاژەڵەکان، جووتبوونی وشترەکان..؟!

خودی قورئان زۆر ڕاست دەکات کاتێك لەبارەی بێ باوەڕەکانەوە دەڵێت:﴿ ... وَٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ يَتَمَتَّعُونَ وَيَأْكُلُونَ كَمَا تَأْكُلُ ٱلْأَنْعَـٰمُ وَٱلنَّارُ مَثْوًى لَّهُمْ ﴾ محمد(١٢). واتە: ( ...ئەوانەش بێبڕوا بوون لەم دنیایەدا ڕادەبوێرن و دەخۆن وەك ئاژەڵ، لە ئایندەشدا دۆزەخ جێ و شوێنیانە).. کەواتە لێرە قورئان ڕەتی ئەوە ناکاتەوە کە ئەوان چێژ وەرناگرن. بەڵام وەك چێژی ئاژەڵ وایە، وەکو لەوەڕی وشترەکان وایە...... ئایا ئەمەیە ئاسوودەیی......؟

ژیـان لەگـەڵ شـەهوەت تـەنها ژیـانی نێربـازی و ناڕەحـەتی و تێرنـەبوون و نقومبوونە لـە ئـارەزووە خنكێنەرەكانـدا. هـیچ پەیوەنـدی بـە ئاسـوودەییيەوە نییە.... چونكە ئاسوودەیی تـەنها حاڵەتێكە، بـە ئاشـتی و هێمنـی دەروونـی و رزگـاربوونی ڕۆح لـە هـەموو بەندایەتیـەكان دەسـتەبەر دەبێـت. پێناسـەی ئاسوودەیی ئەوەیە كـە مـرۆڤ ئاشـتەوایی لـە نێوان خـۆی و دەروونـی، خـۆی و خـەڵكانی تـر، خـۆی و خـودا. دروسـت بكـات...... ئـەم چاكسازییە ئاشـتی و ئاسایشی دەروونی تەنها بە كردەوە بەرقرار دەبێت..... ئەویش بـە ئـەوەی كـە مـرۆڤ هـەموو هێـز و سـامان و تەندروسـتی خـۆی بخاتـە ژێـر خزمـەتكردنی خەڵكانی تر..... بەنیاز و بە كردەوە لەگەڵ كاری چاك و خێرخوازیـدا بـژیت. پەیوەندی نێوان مرۆڤ و خـودا بـە نوێـژ و پاڕانـەوە دروست بكات، لەوكاتـەدا خودای گـەورە ئـارامی و یارمـەتی و ڕۆشنایی بـۆ مـرۆڤ زیـاد دەكات...... ئـەم ئاسوودەییە ئایینە..... ( لابس الخرقة) كابرایەكی سۆفی بوو دەڵێت: ئێمـە لـە خۆشـییەكی زۆر گـەورەدا دەژیـن. ئەگـەر پاشـا و دەسـەڵاتداران بـزانن چ خۆشییەكە بـە شمـشێر شـەڕمان لەگەڵـدا دەكـەن...... ئەوانـەی هەسـت بـەم خۆشییە دەكـەن خۆشـی هـەبوونی پەیوەنـدی لەگـەڵ خـودا، چاكسازی لەگـەڵ نەفس.... ئەوان دەزانن كە قسەی ئەم سۆفییە زۆر ڕاستە.

- باشە تۆ چەند ساڵێك وەكو ئێمـە نـەبووی، وەكـو ئێمـە سـەرخۆش دەبـووی، وەكو ئێمە رات دەبوارد، ئاسوودە دەبووی بەو ئاسوودەیە ئاژەڵەیە كە ئێمە پێ ی ئاسـوودە دەبـین، بـێ بـاوەڕبووی. باسـی بـێ باوەڕیـت كـردووە لـەناو كتێبـی خـۆت بـە نـاوی (الله والأنـسان)، بـەڵكو لـە بـێ باوەڕیـدا پـێش بـێ باوەڕەكـان كەوتبووی ، جا باشە چ شتێك بەو شێوەیە تۆی گۆڕی، لەو شتە بۆ دژەكەی؟!

- خودای گەورە شت دەگۆڕێت بەڵام خۆی ناگۆڕێت.

- دەزانم تۆ دەڵێی ئەمە بە پشتیوانی خودا بوو، بەڵام تۆ ڕۆڵت چیبوو. تۆ چیت کردووە؟

- تەماشای دەوروبەرم کرد، دیتم مردن، پاشان خۆڵ شایەنی پێکەنینە هیچ نییە و گاڵتەجارییە. پاشان ئەم جیهانەم دیت لە دەوروبەرم زۆر بە ووردی و ڕێکو پێکی دروست کراوە، هیچ جێگای سووکایەتی پێکردن نییە..... باشە ئەگەر ژیانم بێ مانا بێت هەروەکو چۆن پیاوە بێ ماناکان بۆی دەچن، کۆتاییەکە هیچ نییە...... باشە من بۆچی دەگرییێم و پێ دەکەنم. پەشیمان دەبم. بۆچی زۆر حەزم لە هەقە و بۆی دەسووتێم، بۆچی حەزم لە دادپەوەرییە. بۆ ئەم ڕەوشتانە خوێن و ژیانم دەکەمە قوربانی؟! ...دیتم ئەستێرەکان لە ئاسماندا بە یاسایەك دەسووڕێنەوە.... دیتم گیانەوەرە کۆمەڵایەتیەکان قسە دەکەن..... گژوگیا دەبیستێت و دەبینێت و هەست دەکات.... دیتم ئاژەڵەکان ڕەوشتیان هەیە...... دیتم مێشکی مرۆڤ زۆر سەرسوڕهێنەرە لە دە هەزار ملیون دەمار پێك دێت، هەموویان لە یەك کاتدا و زۆر بە تەواوی پێکەوە کاردەکەن. هەرکاتێك یەکێکیان لە کار بکەوێت یەکسەر مرۆڤ تووشی شەلەل و کوێریی و لاڵی و ورێنەکردن دەکات، کە ئەمەش ڕووناداتی تەنها هەندێك جار نەبێت...... باشە چ شتێك هەیە ئەم ئامێرە بە سەلامەتی بپارێزێت. کێ ئەم هەموو تەواوی و ڕێکو پێکییەی پێ بەخشیوە؟!....جوانیم دیت لەسەر پەلکە دارەکان، لەسەر کلکی تاووس و لەسەر باڵەکانی پەپوولە. گوێم لە دەنگی موسیقای بلبلەکان و گۆرانی باڵندەکان بوو. بۆ هەر شوێنێك چاوم بسووڕێنم وێنەی وێنەکێشێك دەبینم،

نەخشەی نەخشەسازێك، داهێنانی دەستێكی داهێنەر دەبینم. ئەم سروشتەم دیت زۆر توند و ڕێكو پێك و تەواو بەبێ خەوشی دروست كراوە.... ئەستەمە ئەمە لەناكاو و هەر لە خۆیەوە و بە ڕێككەوت پەیدا ببێت...... بەڵكو هەموو شتێك خەریكە هاوار بكات... دروستكەرێك منی دروستكردووە، داهێنەرێك منی داهێناوە. من قورئانم خوێند، دەنگێك و موسیقایێك هاتە ناو گوێم كە لە هیچ زمانێكدا نییە، عەقڵ و ناخی من هێنایە جۆش، قسە و ووشەكانی قورئان لە هەموو شتێكا كۆتایین ، لە سیاسەت، لە ڕەوشت، لە یاسا و شەریعەت. لە گەردوون و ژیان و نەفس و كۆمەڵگا،.. هەرچەندە كاتێكی زۆری تێپەڕیوە لەسەر دابەزینی، زیاتر لە هەزار و چوارسەد ساڵ دەبێت.... لەگەڵ ئەوەشدا گونجانێكی تەواوی هەیە لەگەڵ هەموو زانستە نوێیەكان. هەرچەندە لەسەر دەستی پیاوێكی نەخوێندەوار، كە نانووسێت و ناخوێنێتەوە،.. لەلایەن گەلێكی دواكەوتوو، زۆر دوور لە پێشكەوتنی شارستانی...... ژیانی ئەم پیاوەم خوێند و زانیم چی كردووە..... پاشان گوتم: ئەو پێغەمبەرە..... ناكرێت پێغەمبەر نەبێت...... هەروەها ناكرێت ئەم گەردوونە جوانە بەبێ دروستكەر بێت، ئەم دروستكەرە هەر خودای گەورەیە، ئەو خودایەی قورئان باسی سیفەت و كارەكانی ئەو دەكات.

- هاوڕێیەكەم زۆر بە ووردی گوێگری قسەكانم بوو، زۆر بە گرنگی وەری دەگرت..... ئینجا گەڕا و كونێكی دۆزییەوە پرسی و گوتی :

- باشە ئەگەر ئەم قسانەی تۆ دەكەی بەو شێوەیە نەبوو. هەموو ئامارەكانت بە نادروست دەرچوون، لە پاش ئەوەی كە تەمەنێكی درێژ تۆ مردی و گەڕایتەوە و بوویتەوە بە خۆڵ، لە پاشان هیچ شتێك نەبوو؟.

- لەو کاتە من هیچ شتێك لەدەست نادەم، چونکە من ژیانی خۆم تێپەڕاند. ئاسوودە بووم، شتم پێشکەش کرد، تا من لە ژیان دابووم دڵخۆشبووم...... بەڵام ئێوە زیانمەند دەبن و زۆر شت لە دەست دەدەن. ئەگەر من ڕاستبم و ئامارەکانم تەواو بن و بۆچوونەکانم وەکو خۆی دەرچوون...... هەر ڕاستیش دەبن، لەوکاتە بۆ تۆی هاوڕێم دەبێتە شتێکی لەناکاو..... لەوکاتە من تەماشای ناوەوەی چاوەکانی ئەوم کرد بەردەوام بووم لە قسە کردن، لەوکاتە دەریاچەیەکی پڕ لە ترس لە چاوەکانی دیاربوو، پێڵوەکانی چاوی بەرز و نزم دەبوون و ساتێکی پڕ لە ترس پێوە دیاربوو...... پاش کاتێکی کەم هاوڕێیەکەم هاتەوە سەرخۆ. هاوسەنگی خۆی وەرگرت.... بەڵام بۆ من ئەم ساتە کەمە بەس بوو، کە بزانم ئەم کابرایە، سەرەڕای لاساری و لووتبەرزی و توندی، لەسەر لێواری گومان و بۆشاییە و، هیچی بەدەستەوە نییە خۆی پێوە بگرێت.

- هاوڕێکەم خۆی کۆکردەوە و هەوڵی دا بە دڵنیایی و دڵنیاییەکی ساختە پێم بڵێت: ئەوەی لە پێشوازی من و تۆ دایە تەنها خۆڵە......

- تۆ دڵنیای؟! ....جارێکی تر گومان و ترس لەسەر چاوەکانی دروست بوو، هەوڵی دا پاڵەپەستۆ بخاتە سەر پیتەکان تاکو وشەکەی فێری لێ نەکات و گوتی: بەڵێ.

- گوتم درۆ دەکەی.... چونکە ئەمە کارێکە بە هیچ شێوەیەك ناتوانی لێی دڵنیا بیت. کاتێك ئەو شەو من خەریکی گەڕانەوە بووم بە تەنیا، دوای گفتوگۆیەکەمان کە زۆر درێژ بوو. من زانیم کە برینێکم لە ناخی ئەودا دروست کردووە. و چاڵێکم لە ژێر فەلسەفە لاوازەکەیدا کۆڵیوە، ئەم چاڵە بە درێژایی ڕۆژەکان گەورە و فراوان دەبێت. سروشتی فەلسەفە لاواز و

لەناوچووەکەی ناتوانێت ئەم چاڵە پڕ بکاتەوە..... من لە ناخی خۆمدا گوتم:
- لەگەڵ ئەمەش دوعای خێرم بۆ دەکرد...... لەوانەیە ئەم ترسە ڕزگاری بکات.... چونکە هەر کەسێك هەموو ڕێگا ڕاستەکان لەسەر خۆی دابخات، بەهۆی کەللەڕەقییەوە، هیچ شتێك ناتوانێت ببێتە ڕزگارکەری تەنها ترس نەبێت. من دەمزانی من ناتوانم بیهێنمە سەر ڕێگای ڕاست، چونکە خودای گەورە بە پێغەمبەرەکەی دەفەرمووێت:﴿ إِنَّكَ لَا تَهْدِي مَنْ أَحْبَبْتَ وَلَٰكِنَّ اللَّهَ يَهْدِي مَن يَشَاءُ ۚ وَهُوَ أَعْلَمُ بِالْمُهْتَدِينَ ﴾ القصص(٥٦). واتە: (بە ڕاستی ئەی پێغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم) تۆ ناتوانیت ئیمان و باوەڕ ببەخشیت بەو کەسەی خۆشت دەوێت، بەڵکو خوا هەر کەسێکی بوێت دەیخاتە سەر ڕێگەی ڕاست و ئیمانی پێدەبەخشێت، خوایش ئاگادارە بەوانەی کە ڕێبازی هیدایەتیان گرتۆتەبەر..). بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هیوای ڕاستەڕێم بۆ دەخواست و دوعای خێرم بۆ دەکرد، چونکە هیچ تاوانێك لە تاوانی بێ باوەڕی گەورەتر و بێ چارەنووستر نییە.

